ئیدریس عەبدوڵڵا ئومەر گومەتی

# هەتا لە ویرمان نەچیون

## لێکۆڵینەوەیەکی مێژوویی ئەدەبیە لەسەر تیرەی دەربەندیەکان و شێوەزارو پەندەکانیان



پرۆفیسۆر عزەدین مستەفا ڕەسوڵ
پێشەکی بۆ نوسیوە

چاپی یەکەم 2014

ئیدریس عەبدوڵڵا ئومەرگومەتی

# هەتالەویرمان نەچیون

لێکۆڵینەوەیەکی مێژوویی ئەدەبیە لەسەر تیرەی دەربەندیەکان و شێوەزار و پەندەکانیان.

چاپی یەکەم
٢٠١٤
کوردستان- سلێمانی

## ناسنامەی کتێب

* ناوی کتێب : هەتا لە ویرمان نەچیون
* نوسەر : ئیدریس عبدوڵلا ئومەرگومەتی
* بابەت : لێکۆڵینەوەی مێژوویی ئەدەبی
* تایپ : نوسەر
* دیزاین : بەشارپەیامی
* هەڵە چنکردن : جومعەکانی لەلەیی
* نۆبەی چاپ : چاپی یەکەم ٢٠١٤
* چاپخانە: کەمال (سلێمانی)
* تیراژ : ( ٥٠٠) دانە

لەبەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتیەکان ژمارەی سپاردنی ( ١٣٩٨)ی ساڵی ( ٢٠١٤ )ی پیێ دراوە.

..................................................



* بەگیانی پاکی( جومعە دەربەندی) کە بە باپیرانی دەربەندیەکان و ئاخێوەرانی ئەم شێوەزارەی ناوچەی (ئومەرگومەت و سێگردکان وکانی لەلە) دادەنرێت.

* بەگیانی پاکی باوکم ..........، دایکی میهرەبانم کەگوڵی جوانی تەمەنی خۆی لە پێناوی مندا وشك کرد.

* بەهاوسەرەخۆشەویستەکەم(چۆپی خان)، وەمناڵەجگەرگۆشەو لەدڵاشیرینەکانم ( ئاریاس و ئەنەس ) زۆربەی کاتەکانی ئەوانم تەرخان کردبۆنوسینەوەی ئەم کتێبە.

سوپاس و پێزانینم بۆ:

* بــــرای بـــەڕێزم ( مــــەلا قـــادر ) ئەنـــدامی پەرلـــەمانی عێــراق کــە ئــەرکی لەچــاپدانی ئــەم کتێبــەی گرتــە ئەســتۆ.

* مامۆســــتا ( بەشـــــار پـــــەیامی)، کەمانــــدو بــــون و شەونخونیەکی زۆری بە دیزاینی کتێبەکەوە بینی .

* پرۆفیســـۆر عـــزدین مســـتفا ڕە ســـوڵ کـــە پێداچـــونەوەو، پێشەکی کتێبەکەی بۆنوسیم .

*مامۆســــتا( دەربــــاز جەوهــــەر) ، (جمعـــــە کـــــانی لەلـــەیی)کەخـــەم خـــۆرو هاوکـــارم بـــوون، لـــە پێـــدانی سەرچاوەی پێویست لەسەر ئەم شێوەزارە.

* هـــەموو ئەوکەســـانەی کـــەم یـــان زۆر هاوکاریـــان کـــردووم، بەتایبـــــەت ئەوکەســــــانەی چــــاو پێکـــــەوتنم لەگـــــەڵیان ئەنجامـــداوە، بەداخـــەوە بەشـــێك لـــەو کەســـانە وەفاتیـــان کرد، مەرگ مەودای نەدان ئەم بەرهەمە ببینن.

## نـــــاوەڕۆک

# دەسپێك

حاجی قادری شاعیر دەڵێ :

لەکوردی حەزنەکا کوردێ مەڵێ بۆچی وەیا چۆنە

لەدایکی پرسیاری کە ئەو بێچووەی لەکووێ هێنا ؟؟؟

خوێنەری بەڕێز ئەم کتێبەی لەبەردەستتدایە بەرهەمی ڕەنجو ماندوو بوونی بێ وچانی ساڵانێکی زۆرە لەگەڕان و لێکۆڵینەوە وچاوپێکەوتن و بەدواداچوون، بۆکۆکردنەوەی مێژوو و ڕەگ و ڕەچەڵەکی تیرەی دەربەندیەکان و وەهۆکاری هاتنیان بۆئەم ناوچەیە، لەگەڵ بەشێك لەو پەندوو قسە نەستەقانەی کەلە سەردەمی کۆنەوە لەلایەن باب و باپیرانمانەوەبەکارهاتوون، لە ئەنجامی ململانێ لەگەڵ ژیان و تاقیکردنەوەیەکی زۆرلەکاروباری ڕۆژانەیان بەتایبەت لەکاروباری کۆمەڵایەتی وکشتوکاڵیاندا کەبەسەرزاریاندا هاتوەو

بەکاریان هێناوە، وەك بڕگەو یاسایەك چەسپیوەو نەوە دوای نەوە لەسەرزاریان ماوەتەوە وەك موڵکێکی نەتەوەیی ئەم میللەتەو ئاخێوەرانی ئەم شێوەزارە لە ناوچەکانی (ئومەرگومەت وسێگردکان و کانی لەلەو سێکانی) بەجێ ماون، ئەم پەندو ووتانە گەوهەرێکی پڕبایەخ و بەهادارن ومایەی شانازیە وەزیندوێتی ئەم شێوەزارە دەگەیەنێت، تەنانەت ئاخێوەرانی ئەم شێوەزارە وەك لە پیاوە بەتەمەنەکان و بیر مەندو شارەزاکانی مێژوەکەیانەوە دەیگێڕنەوە کەزیاتر لە ۳۰۰ساڵ تێپەڕ دەبێت بەسەر نیشتە جێ بوونیان لەم ناوچەیە کەچی تا ئێستاش پارێزگاریان لێکردوەو هەربەم شێوەزاری لوڕی-کەلهوڕی ئاخافتن دەکەن.

بۆیە پارێزگاری لێکردنی ئەم مێژوو وکەلتور و پەندو ووتەبەنرخانە لەلەناوچوون ئەرکی هەموومانە، نەك تەنیا ئەرکی کەسێك . ئەوەی وای لێکردم و زیاتر هانی دام کە دەست بکەم بە کۆکردنەوەو نوسینەوەی مێژووی هاتنی ئەم بنەماڵەیە وکۆکردنەوەی ئەم پەندو ووتەبەنرخانە لەسەرزاری کەسە بەتەمەنەکان و شارەزایانی مێژووی ئەم تیرەیە تەنیا هەستێکی نەتەوەیی و نیشتمانی بەهێزبوو لەناخمدا چەکەرەی کردبوو، هانی دام و هەست بەبەرپرسیاریەتیەکی گەورەبکەم لەبەرامبەر میللەتەکەم و

ئاخێوەرانی ئەم شێوەزارە، چونکە بەبەرچاومەوە ساڵانە چەندان کەس لەکەسەبەتەمەنەکان و ئەوانەی شارەزابوون لە مێژووی هاتنی ئەم تیرەیە وەفاتیان دەکردوو لەگەڵ خۆیاندا ئەو گەوهەرەبەنرخەیان دەبردە ژێرخاکەوە، بەداخەوەزۆرکەسی شارەزاو زانای ئەم شێوەزارە کۆچیانکرد کە لەکاتی خۆیدا نەتوانرا ئەو بەسەرهاتوو مێژووە تاڵ ودوورودرێژە یان بخرێتە سەرلاپەڕەکانی مێژوو تاکو بۆ نەوەکانی ئێستا بمێنێتەوەو سودیان لێوەرگرین، هەر بۆیە وەك هەست کردن بە لێپرسراویەتیمان بەرانبەربەزمانی شیرینی کوردی بەگشتی و شێوەزاری لوڕی-کەڵهوڕی (شێوەی ئاخافتنی دەربەندیەکان) بەتایبەتی ئەرکی ئەم بەدوادا چونە مێژووییە لە ئەستۆبگرم ومێژووی هاتنی ئەم بنەماڵەیە (بنەماڵەی دەربەندیەکان) و بەسەرهات و دەردی سەرییان و هۆکارەکانی هاتنیان لەناوچەکانی (کرماشان لە دەروەند شاهو) بۆناوچەکانی ئێستایان بخەمە ژێر لێکۆڵینەوە لەگەڵ ڕاناوە کەسەسەربەخۆکان کەلە ئاخافتنیانا بەکاریان دێنن و هێنانەوەی نمونەبۆیان، لەگەڵ کۆکردنەوەو ڕێکخستنی هەمووپەندو ووتەبەنرخەکانیان کەبونەتە یاسای ژیان بۆیان و ژمارەیان دەگاتە سەدان پەند.

هەوڵ دان بۆ کۆکردنەوەو ئەرشیف کردن وپاراستنی پەند و ووتە بەنرخەکانیان ئەرکێکی هەنوکەیی و بەرپرسیاریەتیەکی نەتەوەیی و نیشتمانیە و دەکەوێتە سەرشانی هەموو کوردێك نەوەکو تەنها ڕۆشەنبیرانی ئەو بنەماڵەیە، چونکە بەپەندو ئامۆژگاریەکانیان کانیاوی پەندی کوردەواری سازگارتردەکەن.

ئەوەی من لەم کتێبەدا کۆمکردۆتەوەو نوسیوەتەوە زۆربەی پەندو قسە نەستەقەکانیانە کە بە شێوەزاری لوڕی- کەلهوڕی ناوچەی (ئومەرگومەت و سێگردکان و کانی لەلە و سێکانی) کەدابەش کراون بەسەر چەند بەشێکدا وەك پەندی (مێژوویی ، سیاسی، ئاینی، ئابوری ، کۆمەڵایەتی، کشتوکاڵی) بۆهەرپەندێکیش شیکردنەوەم بۆکردوە بەشێوەزاری کرمانجی خوارو کەزمانی نوسین وخوێندە لەباشوری کوردستان.

ئامانجیش لەو شیکردنەوەیە ئەوەیە خوێنەربەباشی لەواتاو مەبەستی ڕاستەقینەی پەندەکان تێبگەن، چونکە زۆربەی پەندەکان لەچەند ووشەیەك تێپەڕناکات بەڵام لەماناو ناوەڕۆکدا دەبێت بەچەند دێرێك.

هەوڵم داوە بە شـــێوەیەك لێکۆڵینەوەکە بخەمە بەردەستی خوێنەرانی کورد تا زۆرترین کەڵك بەخوێنەری مێژوو وئەدەب و

فۆلکلۆری کوردی بگەیەنم هیوادارم ئەم بەرهەمەم ببێتە بەشێك لە خەرمانی کتێبخانەی کوردی، بەو هیوایەم ئەدیبان و ڕۆشەنبیران و نوسەران و لێکۆڵەرەوانی کورد سودی لێوەربگرن و لەهەمانکاتیشدا لەهەرهەڵەوکەموو کورپیەك کەبەسەرماندا تێپەڕیوە لەڕاستکردنەوەکەیدا هاوکارمان بن، بەوەش کتێبەکە بە پێزترو دەوڵەمەند تر دەکەن ئەگەر ڕەخنەو توانجەکانتان لەکات و شوێنی خۆیدابخەنەڕوو.

لەگەڵ ڕێزدا

ئیدریس عەبدوڵڵا ئومەرگومەتی

نەورۆزی ٢٠١٤

## پێشەکی

ڕەنگە لەو کتێبانە دا کەچاپم کردووە یانووسیومن کتێبی (ئەدەبی فۆلکلۆری کوردی) لەناو چەند کتێبێکیان کەبایەخی زۆری پێدراوە، دووجار بەکوردی و سێ جار بەعەرەبی بڵاو کراوەتەوە و لەهەر چا پە شدا دەستکاری و لێ زیادکردن هەیە.

لەو کتێبەدا باسی ( پەندی پێشینان و قسەی نەستەق ) بەشێکی گرنگەو لەدەرگای زمانی کوردیەوە چوونە ناوەوەی ئەو باسایە کە لای هەموو گەلاندا شانازی پێوەدەکرێ و هەندێك پێش گۆرانی دەخەن لەپەیدا بوونی (ئەدەبیاتی گەل) واتە فۆلکلۆردا.

ئێستا کەدەبێ لەرێی کتێبی ( هەتا لەویرمان نەچیوون)ی کاك ئیدریس عەبدوڵلا ئۆمەرگومەتی یەوە شەرەفی نوسینم لەسەر پێشەکی یەکەی دراوەتێ دەبێ بڵێم: ڕاستە پەندی پێشینان ئەنجام و بەرهەمی دنیا دیدەیی و فەلسەفەی کۆمەڵێ خەڵکەو هەموو لایەنەکانی ئەو فەلسەفەیە دەردەخاو بە شێکی هەمیشە دروستبووی

فۆلکلۆره.  شتێك ئەمرۆ قسەو ووتنە سبەینێ دەبێ بەپەند، پەندی پێشینان لەزۆر بابەت زیاتر دەبێ بەنموونەی یەکێتی گەل و نەتەوە. ئەوەتا ئەم پەندانەی ئەم کتێبە بە دیالێکتی لوڕی یا بەشە دیالێکتی کەلهوڕی یە، بەڵام لەزۆر لایەنەوە لەگەڵ پەندی دیالێکت و بەشە دیالێکتەکانیتردا یەکن یانزیکن.

ئەوەتا سەرەتای پەندەکانی ئەم کتێبە بە باسی ژن و دایك دەست پێدەکات کە ژن لەلای کورد پایەیەکی بەرز تری هەبووە لەوەی لای هەندێ میللەتی دراو سێ هەیە، ژن کاری ماڵ و کشتوکاڵ و پەروەردەی لەسەر بووە، ئەمە لەیەکەم پەندەوە دیارە، پەندی دوەمیش بە دیالێکتەکەی خۆی هەرئەوەیە کەلای ئێمە دەڵێ: ( خەسوو لەگەڵ تۆمە بووکێ گوێت لێ بێ) ( خەسویلە دەوەل تومە وەویلە گوێت لەی بووك)، نامەوێ یەکە یەکە لەهەموو پەندەکان بدوێم، چونکە کاك ئیدریس هەموویانی بەو چەشنە لێکداوەتەوە کە ئێمە ئەینووسین. بەڵام با بێمە سەرباسەکانی — سەیر ئەوەیە لەژنەوە دەچێتە سەر (گا).

گا لە کۆندا شتێکی گەورە بووە، ئەو میللەتی کوردەی لە دۆزراوەکانی ئەشکەوتی ( چەرمۆ) وە دیارە کەیەکەم میللەتە دەستی داوەتە کشت و کاڵ ، (گا) هۆی یەکەم، یا ئامێری یەکەمی

ئەو کشت و کاڵەبووە، سەیرە لەگەڵ ئەو بایەخەی (گا) دا کورد وەك هەندێ گەلانیتر نەبووە بە( گاپەرست)،

بەڵك و هەروەك ئامێری بەرهەم هێنان سەیری (گا)ی کردووە.

خاوەنی کتێب ئەو چەند (پەندە) ی لەبارەی (گا) و ئەو ئامێرە گرنگەی تا ئێستاش لە هەندێ شوێندا هەربەکار دێت، بەدرێژی لەلایەنی ئیجابی و سیلبی یەوە لێکداوەتەوە، بەڵام خۆزگە لە ئیدیومی(گای هار- ئەڵێی گای هارەشمی) لێك نەدایەوە کە عەرەبیش هەیانەو( البقرەالهائجە)ی پێ دەڵێن.

چەند پەندی گەورەی ژیان هەیە لەوە بەنرختر کەلە کۆنەوە تا ئێستا بایەخی ماوە( شەڕکەر ئاشتیت لەبیر بێ- شەڕکەری ئاشتی دوپایت لەویر بووك). ئێستاش و لەجاران زیاتر دەبێ ناکۆکی هەر بەئاشتی چارەسەر کرێت.

سەیری ئەم دوو لەیەك چونەش بکەن:

(تێریکایی مـــانگ سەرلە ئیوارە دیارە)

(شەوقی مانگە شەو سەر لە ئێوارە دیارە)

لێرەشدا هاوتایی ( یەکێتیی کورد- یەکێتیی بیر- قووڵیی پێگەی لێکدانەوەدیارە) — لێکدانەوەی پەندەکەش لەم کتێبەدا دیارەو دووبارەی ناکەمەوە.

لە(گا)وە بۆ(بزن) ، لە(گوڵەگەنم)ەوە بۆ( گوڵەجۆ) هەمووی پەیوەندی بە(کشت و کاڵ) و کۆنی پەندی کوردیەوە هەیە .شانازی بەخۆت و گەلی خۆتەوە لەم پەندانەدا دیارە ( تاماڵ وەستا بێت-مزگەوت بەتاڵە).

ناتوانم، یا نەمەوێ یەکە یەکە لەو پەندانە بدوێم کەلەم کتێبە دا هاتوون، چونکە نووسەر خۆی یەك بەیەك پەندەکانی بەو کوردی یە لێکداوەتەوە کەمن پێی ئەنووسم( ئیتر ناوی هەرچی یەك بێت) بەڵام خۆزگە هەر ئەو لێکدانەوە رێك و پێك و جوانە بەتەنیا نەبوایە، بەڵکو لای هەرپەندە ماناکەی (بەم کوردیەش) دەبوو.

بۆئەوەی بکرایە بەکەرەستەی بەراوردی ئەم دوو دیالێکتە کوردی یەش، پاشان خۆزگەیەکیترم هەیە، ئەویش ئەوەیە کە ( پەندی پێشینان ) و (قسەی نەستەق) ی لە یەکتر جیا بکردایەوە، بۆئەوەی هەنگاوێکیتر بچووینایە پێشەوە بۆ جیا کردنەوەی ئەم دووبابەتە کە هێشتا لای گەلانیتریش بەتەواوی سنور لە نێوانیاندا دانەنراوە کەچی دووشتی جیاوازیان پێ دەڵێن، ئەوەتا ئێمە دەڵێن: ( پەندی پێشینان) و(قسەی نەستەق)، عەرەب(الحکم)و (الامثال) دەڵێن- رووس .( پەسلۆڤتسا) و( پاگەفۆرکا) دەڵێن و بەشکەم لەدەرفە تێکیتر دا

بەزمانیتر دا دەگەڕام و وامان دەکرد کە سنووری نێوان ئەم دووبابەتە دیاریبکرایەو بە جیا لێ یان بدواینایە.

لەکۆتایدا دەڵێم ئەم کتێبە هەمووبەشەکانی بەگشتی و ئەم بەشەی پەندی پێشینان و قسەی نەستەقە بەتایبەتی کارێکی بەنرخەو کتێبخانەی کوردی دەوڵەمەندتر دەکات و پڕبەدڵ پیرۆزبایی و دەست خۆشی لەنووسەر دەکەم.

پرۆفیسۆر عزەدین مستەفا ڕەسوڵ
٢٠١٤/٤/١٧ سلێمانی

## زمان وشیوەزاری لوری- کەلهوری (شیوەزاری دەربەندیەکان):

لەبەرەبەیانی مێژووەوە کەمرۆڤەکۆنەکان ئەشکەوتەکانیان جێ هێشت و بۆبەدەست هێنانی بژێوی باشترو زیاتر گەیشتنە پێدەشتەکان لەو ساوە جۆرێك لەئاخافتن و گفتوگۆ دروست بوو لە نێوانیاندا، بەرەبەر بە تێپەڕبوونی کات و بەزیادبوونی ژمارەیان و زۆربوونی پێداویستیەکانیان و دۆزینەوەی سەرچاوەی بژێوی نوێ و دۆزینەوەی دەشتە پان و بەرینەکان ئاخافتنەکانیان چوار چێوەیەکی دیاری کراوی وەرگرت و بوو بەزمانی قسەکردنی مرۆڤی ئەو سەردەمە، لێرەوە بایەخی زمان بەدەرکەوت و بە تێپەڕبوونی کات هەرگروپەو شێوەزارێك لە قسەکردنیان و جۆرێك لە زمانی سەربەخۆی خۆیان وەرگرت، کوردیش بەدەر نەبوەلەم یاسا سروشتیە.

هەموو شێوەزارێك لەبنەڕەتدا زمانێکی سەربەخۆبووە و کۆمەڵە خەلکێك لەکۆندا پێی دواون ، بەلام لەئەنجامی بەریەك کەوتنی شارستانیەتەکان و دۆزینەوەی جوگرافی نوێ شێوەزارێکی بە هێزو بەربلاو هەموو شێوەزارە لاوازەکانی دەوروبەری خۆی لەخۆیدا کۆکردۆتەوە و بەشێوەیەك ئاوێتەی یەکدی بوون کەبتوانن ووشەو زاراوەو هەندێك دەربڕینیان لەیەکتر وەربگرن و ئالوگۆڕیکەن

تاهەموویان پێکەوە زمانێکی سەربەخۆ پێکبهێنن ، هەربۆیە دەبینین زۆربەی نەتەوە زیندوەکانی دنیا فرە دیالێکتن و فرە شێوەزارن.

گومانی تێدانیە زمان بەبڕ بڕەی پشتی دروست بوون و گەشەکردنی کۆمەڵگاو گەشە کردنی ژیانی شارستانیەتی دادەنرێ، بەبێ زمان باری کۆمەڵا یەتی و بەتایبەتی ڕۆشەنبیری کۆمەڵگا پەرە ناسێنێت، چونکە ( زمان پەیڕەوێکی دەنگیە بۆلە یەکتر گەیشتن و یەکتر ناسین بەکاردێت و بەهۆی ڕشتەی وتن و بیستنەوە لەکۆمەڵێکی دیاری کراودا کاردەکات)، واتا ژیان بەبێ بوونی زمان ژیانێکی داخراو یان بڵێین بەژیانێکی نەبو دادەنرێت.[1]

لەچاوپێکەوتنێکم لە گەڵ (پرۆفیسۆر دکتۆر عزدین مستەفا ڕەسوڵ) [2] سەبارەت بەزارو شێوەزارەکانی میللەتی کوردبەگشتی وبەتایبەتیش شێوەزاری لوڕی- کەلھوڕی چەند پرسیارێکم لێکرد لەولآمداگوتی: زمانی کوردی وەك زمان ناسان و لێکۆڵەرەوانی بواری زمان ناسی سەلماندوویانە کەیەکێکە لەزمانەکانی هیندوو ئێرانی، ئەمیش وەك و هەموو زمانەکانی تری جیهان نەتەوەیەك قسەی پێدەکات لەم سەرزەمینە وەفرە دیالێکتیە، واتا چەند زاراوە یێکی لێ بۆتەوەو وەلەو زاراوانەش چەندین شێوەزاری تری لێ دەبێتەوە، هەرشێوەزارێك لەم شێوە زاراوانەش لە شوێنێکی

جوگرافیای دیاری کراو لەم کوردستانەدا دەژین و خەریکی بژێوی ژیانی خۆیانن بەکشتوکاڵ و ئاژەڵداریەوە خەریکن و ژیانی ئاسایی خۆیان دەبەنەسەر.

زمانی کوردی بەپێی لێکدانەوەو بیرو بۆچونەکانی زۆربەی نوسەرانی کورد دابەش دەبێت بۆسەر چوار زاری سەرەکی کەئەوانیش بریتین لەمانەی لای خوارەوە:

١- زاری کرمانجی ژوورو.

٢-زاری کرمانجی خواروو.

٣-زاری گۆران.

٤-زاری لوڕ-کەلهوڕ

زاری لوڕشێوەزارێکی فراوانەو فرە دیالێکتە و شێوەزاری کەلهوڕیش بەشێکە لە لوڕ، وە شێوە زاری کەلهوڕ نەك هەر تیرەی کەلهوڕ قسەی پێدەکەن، بەڵکو گشت ئەو هۆزە کوردانە قسەی پێدەکەن کەلە نێوان کرماشان و شارەباندا، بەرێگای کرماشان-خانەقین، تاسنوری وەچەزاری فەیلی و لەکستان دەژین.

مێژوو نوسی گەورەی کورد (محمد أمین زەکی بەگ ) لە کتێبی خولاسەیەکی تاریخی کوردو کوردستان لەلاپەڕە ٢٢٠-٢٢١، لەبارەی زمانی کرماشانەوە دەڵێت: ( زمانی کرماشان ، لەگەڵ

زمانی کەڵهوڕ، لە هجەیەکی تەواوی کوردیە و زۆر زۆر لەزمانی لەك ئەکا، کە ئەبێت فەرعێکی زمانی ئێرانی بێ. لەلایەکی تریشەوە زۆر فەرقی لەگەڵ زمانی فارسی هەیەو بەکوردی ممکینە کە پێ بڵێن زمانی ( کورد- لەك ) لەسنوری کرماشان ئەو عەشیرەتانەی هەن لەوناوچەیە بریتین لە( عێلی کەڵهوڕ ، عێلی گۆران ، عێلی سنجاوی ، عێلی جاف، عێلی لەك) لەمانە عێلی کەڵهوڕ گەورەترینیان و وەبە هێز ترین عەشیرەتە چ لەڕوی زۆری ژمارەی دانیشتوان یان لەڕوی بەهێزی دەسلاتیان بەسەر ئەم ناوچەیەدا لەدژی دەسلاتی شاکانی سەفەوی.(٣)

بەڕای ئیقباڵ سەفەری کەخۆی خەڵکی (کرماشانە)بەشێوەزاری کەڵهوڕی قســـــەدەکات دەڵێت: شـــێوەزاری کەڵهوڕی لە ناوچەی (کرماشـــــــان) وسەرپێڵی زەهاو ئەوانەی سەربەکەڵهوڕن وبەوشێوەزارەقسەدەکەن، ئەم شوێنانە دەگرێتەوە وەك (گێلانی رۆژئاوا بشێوە، تەواوی دەشتی شائاباد، ئیلام ئاوا، ماهی دەشت، ئەیوان ئیسا لەسەرباریزی ئیلام تا وەك و میهران لەناوچەی کامیاران وکرندوقازانجی وناودەروەند)(دەربەندشاهو) ئەمانە گشتی کەڵهوڕن.(٤)

بەڕای ئیبراهیم باجەلان(٥) کە نوسەرەێکی دیاری عەشیرەتی باجەلانی ناوچەی خانەقینە دەڵێت: لەدوای پەراگەندە بونمان لە

ناوچەکانی کرماشان و سەر پێڵی زەهاو بۆئەم دیو سنور لەناوچەکانی خانەقین گیرساوینەتەوە، باجەڵانەکان کەلە ناوچەکانی کرماشان و سەرپێڵی زەهاو ژیاون بۆیەش پێ یان وتراوە باجەڵان چونکە خەریکی باج کۆکردنەوە بوون واتا باجگربوونە، بەهیچ شێوەیەك باجیان نەداوە بەسوڵتانەکانی عوسمانی و شاکانی سەفەوی، لە درێژەی قسەکانی مامۆستا ئیبراهیم دا دەڵێت: لەکاتی پەلاماری نادرشا بۆ ناوچەکانی کرماشان و سەر پێڵی زەهاو لەساڵی ۱۷۳۰ز ئەو نیمچە دەسەڵات و خێڵ و عەشیرەتانەی لەو ناو چەیەبوون کەوتنە بەر ئەو شاڵاوەو نادرشا دەستی نەپاراست لە تاڵان و کوشتنیان و ڕاوەدونانیان بەتایبەت بنەماڵەی میرەکان کەلەناوچەی کرماشان لە (ناودەروەند-دەروەندشاهو) دەژیان بۆیە بەناچاری کۆچیان کرد بۆ سنورەکانی خانەقین و کەرکوك. باجەڵانەکان لەشێوەزارو قسە کردندا وەك دەربەندیەکانی گوندەکانی ئومەرگومەت و سێگردکان قسە دەکەین بەڵام ئەم شێوەزارە باشتر لەلای ئەوان پارێزراوە کەلە بنەڕەتدا شێوەزاری لوڕ-کەڵهوڕە.

جگە لەمانەی باسمان کرد هەروەها ناوچەکانی (ئومەرگومەت، سێگردکان، کانی لەلە، سێکانی، شیوەجان، کانی ڕەش، کانی ماران، کانی وەتمان ... هتد، ئەمانەش بە شێوەزاری لوڕی-کەڵهوڕی

قسەدەکەن. بەڵام ئەوانەی بەدرێژای مێژوو کە شێوەزارە کەیان پاراستوە تائەمرۆش قسەی پێدەکەن هەردوو گوندی (ئومەرگومەت و سێگردکان وکانی لەلەو سێکانی)، کەتا ئەمڕۆش بەو شێوە زارە قسەدەکەن تەنانەت منالە بچوکەکانیشیان کەزمانی دایك فێردەبێت لەتەمەنی دووساڵیدا بەم زمانە قسەدەکەن. بۆیە حاجی قادری شاعیری گەورەی کورد لەم بارەیەوە دەڵێت:

ئەگەرکوردێك قسەی بابی نەزانێ

موحەقەق دایکی حیزە بابی زانێ

پەراوێزەکان:

١-نەجم خالید ئەلوەنی : پەندو قسەی نەستەقی کوردی شاری خانەقین، چاپخانەی موکریان، هەولێر٢٠٠٨، لاپەرە,٢٠

٢- چاو پێکەوتن لەگەڵ: پرۆفیسۆر دکتۆر عزالدین مستفا رەسوڵ، سلێمانی ، بەرواری ٢٠١٤/٢/٢١، کات ژمێر ١١پێش نیوەرۆ.

٣-محمد ئەمین زەکی بەگ: خولاسەیەکی تاریخی کوردو کوردستان، بەرگی یەکەم و دووەم، دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم، سلێمانی ٢٠٠٠، لاپەرە ٢٢٠-,٢٢١

٤- چاو پێکەوتن لەگەڵ : اقبال سەفەری، لەدایك بووی ١٩٥٣ی کرماشان، لەبەرواری ١٠/١٠/ ٢٠١٣، لەقەلعەی حزبی دیموکرات-کۆیە، کات ژمێر ٣ی دوای نیوەرۆ.

٥- چاو پێکەوتن لەگەڵ : ئیبراهیم باجەلان لەدایك بووی ١٩٤٠ی خانەقین ، لەبەرواری ٢٠١٣/٩/٢١، لە خانەقین، کات ژمێر ١١ی پێش نیوەرۆ.

| شێوەزاری دەربەندیەکان | شێوەزاری کرمانجی خواروو |
|---|---|
| وەوی | بووك |
| دوێت | کچ |
| زمستان | زستان |
| تاوستان | هاوین |
| وهار | بەهار |
| واران | باران |
| وەفر | بەفر |
| ڕهێڵ | لێزمە |
| چەرموو | سپی |
| سوێر | سوور |
| سەوز | کەسك |
| کەوو | شین |
| تێریك | تاریك |
| ڕووناك | ڕۆشن |
| شامی | شوتی-شفتی |

| شێوەزاری دەربەندیەکان | شێوەزاری کرمانجی خواروو |
| --- | --- |
| مەویژ | مێوژ |
| کاڵەك | گندۆرە |
| بووستان | بێستان |
| وەراو | بەراو |
| ناندێن | چێشتخانە |
| کوانی | ئاگردان |
| خوەرەکەوو | خۆڵە مێش |
| ئاش | شیو- چێشت |
| قوین کانی | ئاگردان و چێشتخانە |
| چووستەك | پێڵاو |
| ساقۆ | قەم سەڵە |
| سەرین گولاّن | زبڵدان |
| چڕینەوە | بانگ کردن |
| کامیز | شایان |
| کێ | کا |
| دەوەلیا | لەگەڵیدا |

| شێوەزاری دەربەندیەکان | شێوەزاری کرمانجی خواروو |
|---|---|
| کێ نی | کانی |
| ئەڕا | لەبەرچی |
| کەندڕ | جۆم |
| کۆتان | هەوار |
| کوور | نا بینا |
| مویش | مشك |
| نوخان | نینۆك |
| سەرینگا | بالیف |
| قوغ | کەپر |
| قوغەڵ | گوند |
| ئاوایی | گوند |
| مینگ | دۆڵ |
| سوێرە مووز | زەنگە سورە |
| کەور | ئەشکەوت |
| ڕی | ڕێگا |
| نمەك | خوێ |

| شێوەزاری دەریەندیەکان | شێوەزاری کرمانجی خواروو |
|---|---|
| قجێری | ژاڵە |
| وایم | کاڵە شین |
| کوشیاو | کوشتن |
| مامر | مریشك |
| موتەوا | ڕاوکە |
| لاس | سەرگین |
| کێ یان | کادین |
| حوجرە | دیوەخان |
| پاساری | چۆلەکە |
| دەرزن | دەرزی |
| گندووژ | سوژن |
| قەڵماسنگ | قۆچەقانی |
| بن شەواڵ | بەن دۆخین |
| لوویت | کەپوو |
| لالە | کاك |
| ئاسیاو | ئاش |

| شێوەزاری دەربەندیەکان | شێوەزاری کرمانجی خواروو |
|---|---|
| بارەسیاو | باراش |
| درەو | دروێنە |
| کێنی | کانیاو |
| ئەستێر | بەنداو |
| نەردەوان | قادرمە، پەیژە |
| بان هەربان | تابقی سەرەوە |
| سەرشورەك | حەمام |
| پاخەسوی | بەربووك |
| خورج | جواڵ |
| ئاروو | خەیار |
| وایستن | ویستن |
| ئەڕا | بۆچی |
| خوەش | خۆش |
| مەورە ، مەوو | مەیەرە،مەیە(نەرێی "هاتن" ە) |
| بیار | بهێنە |
| تەمیح بوون | پەند وەرگرتن |

| | |
|---|---|
| هیشتر | چیتر |
| مێندی | ماندوو |
| شیت | شێت |
| وارِك | بارۆکە(نێوان مریشك و جوجك) |
| جوایز بینەوە | جودابوونەوە |
| مەدوونەم | مەم دوێنە |
| ئەو قەرە ، ئەی قەرە | ئەوەندە |
| کەسەر | خەفەت |
| چویٚ | چی |
| کورە | کویٚ |
| چوین | چۆن |
| ڕا | بۆ |
| بین | بوون |
| خوەندن | خوێندن |
| نویسین | نووسین |
| خەندین | پێکەنین |
| چەو | چاو |

| | |
|---|---|
| واتن | ویستن |
| چم | دەچم |
| کو | کۆیە |
| چمە کو | دەچم بۆ کۆیە |
| چما | بۆچی |
| دویرکەفتن | دوورکەوتەوە |
| خلیچك | زۆر خاو لە هەڵسوکەوت |

*لە ئەنجامی چاو پێکەوتنەکام لەگەڵ ژن و پیاوە بەتەمەنەکان و بیرمەندەکانی دەربەندیەکان توانیم  ئەم وشانەی سەرەوە کەلە شێوەزاری خۆیان بەکاریان دەهێنن، ئەم وشانەش لەزاری ئەوانەوە وەربگرم و لەنەمان لەناوچون بیان پارێزم. لەکتێبەکەشدا بەشێوەی بەراورد کردنی لەگەڵ شێوەزاری کرمانجی خواروودا بەکارم هێناوە بۆئەوەی خوێنەر بەباشی لەواتاکانی بگات.

## ڕانـــــاو :

١-ڕاناو: ((وشەیەکە لە زمانی کوردی دا دەورێکی گرنگ دەبینێت وەلەبری کەسێك ، یان شتێك، بەکاردەهێنرێت لە ئاخاوتندا)) .

٢-ڕاناو: ((وشەیەکە ناوی کەسێك یان شتێکی تایبەت نی یە، بەلاّم شوێنی کەسێك یان شتێك دەگرێت کەدەلالەت لە کەسێك یان شتێکی تایبەت دەکات)) .

**ڕاناوە کەسییە سەربەخۆکان لە ڕستەدا بەکاردەهێنرێت لە شوێنی کەسە تاك و کۆیەکان وکەسەکانیش بریتین لە:**

یەکەمی

١ . کەسی یەکەمی تاك بۆ نمونە :

من هەوای خاوین هەڵمژم.(من). من هەوای پاك هەڵدەمژم.(من).

٢ . کەسی یەکەمی کۆ بۆنمونە: ئیمە دژ بەدوژمن شەڕدکەین.(ئیمە).

ئێمە دژی دوژمن دەجەنگین.( ئێمە).

دووەمی

١. کەسی دووەمی تاك بۆ نمونە :

تو گوڵ دچینی.( تو). تۆ گوڵ دەچێنیت.( تۆ).

٢. کەسی دووەمی کۆ بۆ نمونە: ئیوە چیا هەڵکولن. (ئیوە)

ئێوە چیا هەڵدەکۆڵن.(ئێوە).

سێیەم

١. کەسی سێ یەمی تاك بۆ نمونە:

ئەوی عەردەکە وژار کەیك. (ئەوی). ئەو زەویەکەبژاردەکات. (ئەو).

٢. کەسی سێ یەمی کۆ بۆ نمونە :

ئەوان نامەکە چێناند ن.(ئەوان). ئەوان نەمامەکەیان چاند. (ئەوان).

* ئەوەی، کە تێبینی دەکرێ لە بارەی ڕاناوە کەسییە سەربەخۆکان لە شێوەزاری کەلھوری ئەم ناوچەیە و جیاوازی لە.گەڵ ڕاناوە کەسییە سەربەخۆکان لە شێوەزاری کرمانجی ناوەڕاست ئەوەیە کەتەنها چەند فۆنیمێك لە شێوەزاری کەلھوری ئەم ناوچەیە گۆڕانیان بەسەردا دێت ، کە بریتین لە:

١. فۆنیمی ( ێ) لە کەسی یەکەمی کۆ( ئێمە) لە شێوەزاری کرمانجی ناوەڕاست دەگۆڕێ بۆ ( ی) لە شێوەزاری کەلھوری ئەم ناوچەیە واتە کەسی یەکەمی کۆ دەبێتە (ئیمە).

٢ . فۆنیمی ( ۆ) لە کەسی دووەمی تاك لە شێوەزاری کرمانجی ناوەڕاست دەگۆڕی بۆ( و) لە شێوەزاری کەلھوری ئەم ناوچەیە واتە کەسی دووەمی تاك دەبێتە( تو).

٣. فۆنیمی ( ئ) لە کەسی دووەمی کۆ( ئێوه) لە شێوەزاری کرمانجی ناوەڕاست دەگۆڕێ بۆ ( ی) لە شێوەزاری کەڵهوڕی ئەم ناوچەیە واتە کەسی دووەمی کۆ دەبێتە( ئیوه).

٤. کەسی سێ یەمی تاك لە شێوەزاری کرمانجی ناوەڕاست (ئەو) دەگۆڕێ بۆ ( ئەوی) لە شێوەزاری کەڵهوڕی ئەم ناوچەیە واتە فۆنیمی ( ی) بۆ زیاد دەبێت

ڕاناوە کەسی یەسەربەخۆکان لە شێوەزاری کەڵهوڕی ئەم ناوچەیە بەم شێوەیە دەردەکەوێت :

| کەسەکان | تاك | کۆ |
|---|---|---|
| یەکەم | من | ئیمە |
| دووەم | تو | ئیوه |
| سێ یەم | ئەوی | ئەوان |

**ڕاناوە کەسی یەسەربەخۆکان لە شێوەزاری کرمانجی ناوەڕاست بەم شێوەیە دەردەکەوێت:**

| کەسەکان | تاك | کۆ |
|---|---|---|
| یەکەم | من | ئێمە |
| دووەم | تۆ | ئێوە |
| سیّ یەم | ئەو | ئەوان |

*بۆباسکردنی ڕاناوە کەسیە سەربەخۆکان سودم لە لێکۆڵینەوەیەکی دەرچونی بلاونەکراوەی خوێندکار( هەڵمەت حەمەدأمین )بینیوە بەناو نیشانی (ڕاناوە کەسییە سەربەخۆکان لە شێوەزاری لوڕی) کەلەساڵی ۲۰۰۸ز پێش کەش بەزانکۆی کۆیەکراوە بۆبەدەست هێنانی بڕوانامەی بەکالۆریۆس لەزمان و ئەدەبی کوردی.



لەوەرچوێ بەس بویش لەوەر چوێ (لەبەرچی پێم بڵێ لەبەرچی)
بەم دویشی دەست لەم کەرەوە (پێم دەڵێیت دەستم لێ بکەرەوە)
چوێ وەتیوم....چوێ کردیوم (چیم ووتووە... چیم کردووە)
ڕاکوشیەم بەکەسەرەوە (بۆ دەمکوژی بە خەفەتەوە)

* * *

لەوەرچوێ ئاخر دەوەلما (لەبەرچی ئاخر لە گەڵما)
وابێ ڕەحمانە ڕەفتارکەی (وا بێ بەزەییانە ڕەفتاردەکەی؟)
ڕامەلی ئاسوودەی دڵم (بۆ مەلی ئاسودەی دڵم)
لە هێللانەی عیشقت تارکەی (لە هێلانەی عیشقت دەتارێنی؟)

* * *

بەدکار لەبن گوێت خوەندەستەی.(بەدکار لە بن گوێی خوێندوی)
وادوودڵ بیت لەدڵداری (وا دوو دڵ بویتە لە دڵداری؟)

یا هەر بەئەقڵە شیتانەت    (یاخود بە بیری شێتانەت)
لە خۆڕا واز لەم دیاری    (بەبێ هۆ واز لە من دێنیت؟)

* * *

نا...نا بگەردەوە سەرخوەت    (نا نا بگەڕێوە سەر خۆت)
نەکەی دوودڵی و ڕاڕایی    (نەکەی دوو دڵی و ڕاڕایی)
دەخیل لەم جوایزنەبیەوە    (تکایە لێم جیا مەبەوە)
دوێتەجیم مەیل بەتەنیایی    (کچێ جێم مەهێڵە بە تەنهایی)

## بەت نەوەتم

بەت نەوەتم (پێتم نەووت؟)

دوێتەبڕوێ........دڵ بەت نێدەم (کچێ بڕۆ.. دڵت پێ نادەم)

دویرەوەکەف...مەورە سەر ڕیم (دوورکەوەلێم.. مەیە سەرڕێم)

وازلەم بیار (وازم لێ بێنە)

سوێند خواردیوم (سوێندم خواردووە)

سوێند هەزارجار (سوێند هەزار جار

قەت هیچ دوێتیك (هەرگیز هیچ کچێك)

نێلاونم و..قەت هیچ دوێتیك(نالاوێنمەوەو هەرگیز هیچ کچێك)

نێگرم بەیار...؟! (ناگرم بە یار)

* * *

بەت نەوەتم (پێتم نەووت؟)

لەوەر ئەوەی (لەبەر ئەوەی)

ئەوقەرە دوێت (ئەو هەموو کچە)

درو دەوەلماکردیون (درۆیان لەگەڵ کردووم)

تەمیح بیوم (پەندم وەرگرتووە)

پەندودەرس وەرگرتیوم (پەند و وانەم وەرگرتووە)

لەعیشق و دلّداری کردن (لە عیشق و دلّداری کردن)
یەکجاری دەست هەلّگرتیوم (یەکجاری دەستم هەلّگرتووە)

* * *

بەت نەوەتم (پێتم نەووت؟)
بەسەبا هیشتر نەویشم (بەسە با چیتر نەلّێم)
خوەت بەمەوە مێندی مەکە (خۆت پێمەوە ماندوو مەکە)
مەدونەم و ........ بەلامامەو (مەم دوێنەو و بە لاما مەیە)
جاریك تر هەلّنێخەلّەتم (جارێکی تر فریو ناخۆم)
بەقسەی خوەش (بە قسەی خۆش)
بەخەندین وبە جوانی چەو.....؟! (بە پێکەنین و جوانی چاو)

------ ----------- ------------- ---

* ئەم دوو پارچە هۆنراوەیە ( لەوەرچوێ و بەت نەوەتم) لەدیوانە شیعری (نۆتەی ئاوازێکی نوێ)ی برای بەڕێزم فاتح بێ لان تالّەبانی وەرگیراوە کە لە سالّی ٢٠٠٤بەچاپ گەیەنراوە کەبە شێوەزاری دەربەندیەکانی ناوچەی نومەرگومەت و سێگردکان و کانی لەلە نوسراوە.

## پێناسەی پەندی پێشینان

پەندی پێشینان گەوهەرێکی بەهاداری میللەتە وە بەرهەمێکی فۆلکلۆریە کەلە نەتەوەیەکەوە بۆنەتەوەیەکی تر بەهۆی زمانەوە دەگوازرێتەوە، ئەم پەندانە لە هزروو خەیاڵی خەڵکی بەئەزمون و بیرمەندو شارەزا دەمێنەوە لەکاتی پێویست دا خەڵکی بۆئامۆژگاری بەکاری دەهێنن، پەندیش لەئەنجامی تاقیکاریەکانی ژیانەوە بۆنەوەکان بەجێ دەمینێت، یاخود ڕووداوێك کەپێشتر ڕویانداوە خەڵکانێك کە ئەو ڕووداوانەیان بینیوە لە قالبێکی شعریدا یاخود وەك پەندی پێشینان کورتیان کردۆتەوە دەریان بڕیوە، تاببنە وانەیەکی بەسود بۆکەسانی تر تا هەمان هەڵەو پەڵەو کەموو کورتی و ناتەواوی دووبارە نەکەنەوە.

بۆنمونە(دایکە بوینەو دوێتەبخوازە دڵت هیچ نەکەیك پەرەوازە) یان ( لەناو خوەیك لەپەڕ خەفیك) یان (گالە گێرەی گاوس خوەی سەری ژان کەیك)، هەڵبەتە پیاوە داناو ژیرەکانی ئەو سەردەمە کارە سات و ڕووداوە کۆمەڵایەتی و کارە نەخوازراوەکانیان بینیوە پاشان لەچوار چێوەی پەندو ووتەی نەستەقدا هۆنیو یانەتەوەو ڕێکیان خستوە.

بۆئەوەی بزانین پەندی پێشینان چیەو چ مانایەك دەبەخشێت، ڕاو بۆچونی هەندێك لەزاناو نوسەری نەتەوەكانی تر دەخەینە بەرچاو، بۆزیاتر تێگەیشتنمان دەربارەی ئەم بەشە زیندوەی فۆلكلۆ، چۆن پەندی پێشینان لای میللەتی كورد جێگەی شانازیەو بەرزوو بەنرخە، ئاواش لای میللەتانی تر بەرزووبەنرخ بوەو جێگەو بەهاوبایەخی خۆی هەیە، نوسەران و فۆلكلۆر دۆستانی ئەوانیش گەلێك پێناسەو بیرو بۆچونی جیا جیا یان هەیە لەسەر پەندی پێشینان، یەكێك لەشارەزایانی ئەو بوارە (بۆری سكۆلۆڤ) ی ڕوسیەو پێی وایە: ( پەندی پێشینان لەڕستەی كورت و سوك وئاسان پێك هاتووە، لە ئاخاوتنی ڕۆژانەی خەڵك دا بەسەر زماندا دێن بڕگەو ووشەكانی بەجۆرێكن چەشنە مۆسیقایەكی تایبەتیان هەیە )[1]. ئەم شارەزایە وای بۆدەچێت كەپەندی پێشینان ئەو وشانەیە كەلەكاتی دەر بڕین لەسەر زارمان قورسایی دروست ناكەن، یاخود ئەم جۆرە دەر بڕینە شوێنی تایبەتیان بۆدیاری نەكراوە، لێرەدا مەبەستمان ئەو شوێنە گشتیانەیە وەك كۆڕوو كۆبوونەوەو یاخود هەرشوێنێكی تر هەر لەناو خەڵكداو بەشێوەیەكی ئاسایی دەر دەبڕ درێت و ئاسانیشە لەدەربڕین، ڕەنگە لەكاتی ئاخاوتن بەشێوەیەكی زۆر سادە دەربڕێن،زۆربەشیان لەچوار چێوەی وەزن و قافیە ڕێكخراون.

لێکۆڵەری ئینگلیزی ( ئارتەرتایلور ) ڕای تایبەتی خۆی هەیەو دەڵێ:

( پەندی پێشینان ڕستەیەکی ڕێك و پێك و جوان و دارێژراوە وەك وتەیەکیی بە توێکڵ و پڕمانا لە ناو خەڵکدا بڵاو بۆتەوە)[٢].

بە بۆچونی ئەم لێکۆڵەرە ناودارە سەبارەت بە پەندی پێشینان ڕای وایە کەپەندی پێشینان لە ئەنجامی پڕمانایی ووشەکان وادەکات شێوە ڕستەیەکی جوان خۆی پیشان بدات لەئەنجامی جوانی و پڕمانایی لای خەڵك جێگەی سەرنج ڕاکێشانی خەڵکەکەیە .

(مەڕزوقی ) دەربارەی پەندی پێشینان وای بۆدەچێت کە ( پەند پوختەیەکە لەقسە، کەلەسەر چاوەیەکەوە وەر گیراوە یان لە پڕ بەدەمدا هاتووە، کەواتە پەند وەکو نیشانەیەك، یان بەواتایەك ناسراوە، وەدەگوێزرێتەوە بۆ هەر شتێکی تر کەهەمان واتاو مەبەست بگەیەنێت، زۆر جار پێدە چێت واتاو مەبەستی یەکەم نەزانرێت، بەڵام پەندەکە خۆی دەماو دەم گوێزرا بێتەوە)[٣]. بەڕای (مەرزوقی ) پەند جۆرێکی پوخت و ناسك و جوانە لە قسە کردن، کەناتوانین ئەم پەند گوتنە کات و شوێن و سنوری بۆ دیاری بکەین بەو پێیەیی ڕووداوە کۆمەڵایەتیەکان شوێن و کات و جۆرو شێوەیان نادیارە، واتا سنور نیە بۆ پەند وتن لەکاتی ئاخاوتن.

پەند گوزارشتە لەواتایەك دەگوازرێتەوە یاخود ڕەنگە نەزانین واتای یەکەمی چیە، یان ئەم پەندە بۆچی وتراوە، بەڵام پەندەکەوەك و خۆی ماوەتەوە. هەروەها نوسەری عەرەبی ( أحمد أمين) لەبارەی پەندی پێشینانەوە بۆچونی خۆی هەیە و دەڵێت : ( قسەی پێشینان (الامثال) جۆرێکە لە جۆرەکانی ئەدەب و بەووشە کورتی و ماناجوانی و ڕەوانبێژی لە ئاخاوتنی ئاسایی جیا دەکرێتەوە)[٤].

بەبۆچونی ئەم نوسەرە پەند گوتنێکی بێ چوار چێوە نیە بەڵکو گوتنێکی ڕێکخراوەو ماناو واتایەکی دیاری کراو بەدەستەوە دەدات، ڕەنگە لەکاتی قسە کردنماندا لەبارەی بابەتێکەوە یان هەر شتێکی تر بەشێوەیەکی درێژ لەسەری بدوێین، بەڵام دەربڕینەکانما لەڕوانگەی پەندەوە تەنها بەوشەیەك یاخود بەدەر بڕینێکی کورت جێگەی ئەو شێوازە زۆر وتنە بگرێتەوە.

زانای فۆلکلۆریستی ئەڵمانیش (فريد ريش زايلر) لەبارەی پەندی پێشینانەوە بۆچونی وایە...( پەندی پێشینان چەند دەربڕینێکی ڕێك و پێك وپتەون بەزۆری شێوەی فێرکردن، ئامۆژگاریان پێوە دیارە و خۆیان لە ڕوخسارو شێوەی ئاخاوتنی ئاسایی دەنوێنن)[٥].

پێشتریش ئاماژەمان پێکرد کەپەند شێوەیەکی ڕێك و جوانی خۆی هەیە هەروەها لەشێوازی دەربڕینیش پڕمانایی خۆیان دەنوێنن

کە شێوەی و فێرکردن یان ئامۆژگاری لێبکەوێتەوە یان زۆر جاریش وەك تانەو تەشەر بەكار هاتوە بەرامبەر بەكەسەكان.

ئەمانەی کەلە سەرەوە باسمان کرد ڕاو بۆچونی چەند نوسەرێکی بیانی بوو لەسەر پەندی پێشینان و قسەی نەستەق کەهەر یەکەیان بەشێوەی جیاجیا لێکدانەوەیان بۆکردبوو، دەبێ ئەوەش بزانین نوسەران وڕۆشەنبیرانی خۆشمان دەربارەی پەندی پێشینان چیان نوسیوە کەلە خوارە ئاماژەی پێدەکەین.

(د.عیزەدین مستەفا ڕەسوڵ) گەورەترین فەیلەسوفی بواری ئەدەب و فۆلکلۆری کوردی پێ ی وایە:-( پەندی پێشینان ڕستەو وتەیەکی کورتە مانایەکی فراوان و قوڵی تێدایە .... هەرلەسەر پەندی پێشینان بەردەوام دەبێ دەڵێت : ئەم پەندە هەمیشە لەلای گەلانی سەرەتایی و سادەدا فەلسەفەی ڕاستەقینەیی و لەکاری لە خۆوە، هەمووسەرە داوێکی ژیانی ئادەمیزاد، هەموو کردارێك، یاچاك یان خراپ، هەموو گەیشتنە ئەنجامێك کە میللەت گەیشتبێت، دەربارەی هەرچیەك بیت ئەچێتە تەرازووی پەندی پێشینانەوە)[٦].

دەتوانین بۆچونەکەی ( د.عزدین مستفا ڕەسوڵ ) وابخو یێنینەوە کەناتوانین پەند وەك شیعرو چیرۆك و پەخشان یان وەك هەر بەر

هەمێکی تری ئەدەبی ناوی خاوەنەکەی دیاری بکەین، چونکە پەند بەشێکە لە فۆلکلۆر، هەڵبەتە فۆلکلۆریش میللەت خاوەنیەتی و بەرهەمی تاقی کردنەوەو ئەز مونەکانی ژیانی هەمووتاکەکانی کۆمەڵگەیە هەروەکو پێشتریش ئاماژەمان پێی دا کەپەند ڤوتەو دەر برینێکی لەڕوخساردا سادەیەو لە ناوەڕۆکیشدا پڕمانایە.

(عەلی معروف شارەزووری) لە بارەی پەندی پێشینانەوە سەرنجی تایبەت بەخۆی هەیەو بۆچونی وایەکەدەڵێت :- ( پەندی پێشینان کۆمەڵە وتارو ئامۆژگاریەکی کاریگەرو ڕێك و پێکە، پڕشنگدارو بەنرخە، لە باو باپیرانمان و داو داپیرانمانەوە کەپێش چەندەها ساڵ لەمەو پێش وتویانەو بەکەلە پور بۆمان بەجێ ماوەو دەمێنێتەوە...)[7]. مەبەستی ئەوەیە کەپەندی پێشینان کۆمەڵێك وشەی ئامۆژگاری جوانە، کە ئەمانەش بەرهەمی نەنەو باو باپیرمانە بۆمان بەجێ ماوە وەکو مولکو سامانێکی نەتەوەیی تاوەکو سودی لێوەرگرین، ئەمەش بۆسەردەمانێکی زۆر لەمەو پێش دەگێڕ درێتەوە.

بیر مەندی گەورە ( مسعود محمد) بەهەمان شێوە پێناسەیەکی پەندی پێشینانی کردوە ئاماژەی بەوە داوە کە:- (فۆلکلۆری کوردی

هی هەموو کوردەو دڵ ودەرونی هەموویاخود دڵ ودەرونی تێکڕای خەڵکەکە دوبارە دەکاتەوە)[٨].

لێرەدا مەبەستی ئەوەیە کە پەندی پێشینان بەرهەمی هەموو تاکێکی کوردەو بێ جیاوازی لە نێوان ڕەگەزەکان کەوەکو بابە تێکی دەرونی دڵ و دەرونی هەموو خەڵکی دووبارە دەکاتەوە.

( کەریم شارەزا ) لەبارەی پەندی پێشینانەوە بیرو ڕای وایە :(پەندی پێشینان بەشێکی گرنگ و بەنرخی ئەدەبی فۆلکلۆری گەلە، لەئەنجامی بەسەرهاتی کاریگەرو تاقی کردنەوەی پیرو پێشینانەوە گوتراون و کەو تونەتە سەرزمانی گەورەو بچووك و تاڕادەیەك بوون بەبەندی دەستوری ژیانی کۆمەلایەتی و ئابوری و سیاسی میللەتی کوردوو بەبەشێکی جودانەکراوەی ژیانی ماددی ڕۆڵەکانی کۆمەڵگا)[٩]. بۆچونەکەی کەریم شارەزا هەڵقولاوی بەسەرهات ورووداوەکانی ناو کۆمەڵگەی کوردەواریە و زادەی هەموو ئەو ئەزموون و تاقی کردنەوەو تاڵ و ناخۆشانەیە کەبەدرێژایی ڕۆژگاری کۆن لەناو تاکەکانی کۆمەڵگەی کوردی دا بوون بە گوتەی ناودارو پەندو ئامۆژگاری هەموو کۆمەڵگا..

( علائدین سجادی) سەبارەت بە پەندی پێشینان بۆچونی خۆی دەر دەبڕێت و دەڵێت: ( پەندی پێشینان بریتین لەچەند وتەیەکی

کورتی کوردی پێکەوە نوسێنراو مانایەکی بەرزیان تێدایە لەزەمانێکی کۆنەوە کەوتونەتە سەرزمانی خەڵك و ناو زمان و ڕیزمانی کوردیەوە، چۆنیەتی ژیان و ڕەوشت و بیرو باوەڕیان پیشان دەدەن)[١٠]. بەهەمان بۆچونی نوسەران و ڕۆشەنبیرانی کورد کەلە پێشوتردا باسمان کرد ئەمیش بۆچونی وایە پەندی پێشینان چەند دەربڕینێکی کورت و مانایەکی تەواو دەدەن بەدەستەوەکەهەڵەکانمان ڕاست دەکەنەوەیاخود دەبێت بە ئاماژەیەکی ڕوون بۆنەوەی ئێستا تاپەندو دەقە نەستەقەکانْ بۆژیانی ئێستایان بکەن بەزەخیرەو ڕێسایەکی دروست و لەکارو باری ژیانی ڕۆژانە سودی لێ وەرگرن.

بەڵام مامۆستا(عومەر شێخەڵا) دەڵێت:- (پەندی کوردی بریتیە لە ڕستەیەکی کورتی سادەو لێکدراوی سەرزاری ڕەمەکی مەردەم وەیا پەخشانێکی ڕازاوە یان یەك دوو هۆنراوەن چەمك و واتایەکی گەورە دەدەن بەدەستەوە، لە بۆنەیەکی کوردیدا دارێژراون) وەیاخودبەهەمان شێوەی پێشوترهەرسەبارەت بە پەند ئاماژەدەکات و دەڵێت :- ( پەند چەشەیەکی ناسکی ئەندێشەی باب و باپیرانمانە، لە ئەنجامی بەراورد و تاقیکردنەوەیەکی دوورو درێژی ڕۆژگارەوە هاتونەتەکایەوە، چۆنیەتی ژیان و بەسەرهاتی باری ئابوری و نەریت و کۆمەڵایەتی دەردەبڕن)[١١]. لێرەدا مامۆستا (عومەر شێخەڵا) پێی

وابوە پەندی کوردی بەشێکی دانە بڕاوو گرنگی ئەدەبی کوردیە، واتا وەکو بەر هەمێکی ئەدەبی سەیری کردووە لەڕوی جوانی و ڕوخسارو شێوەی دارشتنیان لەهەمان کاتیش بەشێوەیەکی زۆر جوان پڕمانای خۆیان دەدەن بەدەستەوە وەهەروە ها لە هەمانکاتیشدا دەڵێت:- (پەند لەئەنجامی ژیانی ڕۆژگاری باو باپیرانەوە یاخود لە ئەنجامی تاقیکردنەوەی کارەکانی ڕۆژانەی خەڵك لەو ڕۆژگارەیاندا هەوێنێك بوون بۆ سەرهەڵدانی پەندی کوردی و سەرکەوتن یاخود تاقیکردنەوەیان لەو ڕۆژگارە پەندی کوردی سەریهەڵداوە. هەروەها بەلای مامۆستا (جەمال بابان یشەوە) پەندی کوردی :-( ئەو وتراوە کورتە جێماوە کەلە بیرو باوەڕی گەلەوە، لەئەنجامی تاقیکردنەوەو بەراوردا هەڵقولاوە). لێرەدا مەبەستی ئەوەیە کەپەند وتراوێکی کورتە جێماوە بۆخەڵك ئەمەش لەباوەڕی گەلەوەیە، هۆکاری ئەمەش لە ئەنجامی تاقیکردنەوەی ژیانی خەڵکەوە هەڵقولاوە.

هەروەها (شێخ محمدی خاڵ ) یش سەرنج و ڕامانی خۆی لەسەر پەندی کوردی دەربڕیوە ودەڵێت: ( وتارێکی کورتی، ڕێك و پێك، جوانی، بەتامی، بەتەوژمی کاریگەرە، کەدڵ و دەرونێکی، بێداری، ئاوەدانی، ئاگاداری پێشینانەوە هاتبێتەدەرەوە، لەدوای بەراورد وو تاقیکردنەوە یەکی دوورو درێژ)[١٢]. هەروەها سەبارەت بە پەندی

پێشینان دەڵێت :- ( فەلسەفەی ژیان و دەنگی تاقیکردنەوەی جیهان و بەری ڕەوانبیژی (بلاغە)و ڕەوانبیژانە کەلە باو باپیران لە هەزار ساڵەوە، بەکەلە پورێکی ویژەیی، بۆیان بە جێهێشتوین، تا بیانکەین بە ئاوێنەی ڕوناکی ژیان بۆخۆمان). دوبارە هەر سەبارەت بە پەندی پێشینان دەڵێت: ( لە هەموو شتێك کاریگەرترە لەدڵی ڕۆڵەکانی کۆمەڵی کوردەواریدا، چونکە لەدەرونی خۆیانەوە هەڵقوڵاوە ولەسەر پەڕەی دڵیان هەڵکەندراوە، لەبەر ئەوە هەموو کەسێك بەلایەوە جوانەو لە کاتی قسە کردندا بۆ بەهێز کردنەوەی قسەکانی خۆی دەڵێت وەك پەندی پێشینان دەڵێ) .هەروەکو پێناسەکانی پێشو ئاماژە بەوە دەکاتەوە کەپەندی پێشینان وتارێکی چڕو پڕە لەڕوی کورتی و پڕمانایی و ڕەوانی و دەرس وەرگرتن یاخوت ڕاست کردنەوەی بیری خەڵکی لەکارەکانی ڕۆژانەی ئەمەش لەئەنجامی بەراورد کردنێکی زۆری ماوەی ڕۆژگار دێتە ئاراوە، بەهەمان شێوە باسی خۆماڵی پەندی کردوە ئەمەلەلایەك لەلایەکی ترکاریگەری لەدڵ و دەرونی خەڵکە، ئەمەش بەهۆی ئەوەی کەپەندەکە خۆی خۆماڵیە، ئەمەش وای کردوە کە کەسی قسەکەر بۆ بە هێزکردنی قسەکانی و جوانی و باوەر بون بەقسەکانی بۆکەسی گوێگر وەك و وتەیەکی جوان دووپاتی دەکاتەوەو دەڵێ:- وەك و پەندی پێشینان

وتویانە واتا پەندەکە وەك و نمونەیەکی کاریگەرو جوان دەهێنێتەوە تالەگەل واتای قسەکانیدا یەك بگرنەوە کەسی بەرامبەر تێبگات لە مەبەستی. وەهەروەها پەندی پێشینان لای نوسەر( حەمید گەردی )بەم شێوەیە لێکدانەوەی بۆکردوە بەبۆچونی ئەو دەڵێت:- ( پەندی پێشینان، وتارێکی رێك و پێکی جوان و ڕازاوەو بەتام و بەتینی کاریگەرە، پەندی پێشینان میرات و کەلە پورێکی ئەدەبیە، باب و باپیرانمان لە هەزاران ساڵ لەمەو بەر بۆیان بەجێ هێشتوین)(١٣).

بەڕای ئەم نوسەرە پەند وتاریکی جوانە، وەك شتێکی جوان ڕازاوەتەوە ئەمە لەلایەك لەلایەکی تر جوانی بەتام و کاریگەری لە دەرونی خەڵك و دەرس وەرگرتن لەپەند پێناس دەکات، لەهەمانکاتدا سەبارەت بەوەش کەمولکی خەڵکی خۆمانە واتا بەرهەمی باب و باپیرانمانە بۆمان بەجێماوە. وەهەروەهاڕوناك بیر خاتو (نوخشە محمد ابراهیم) لەبارەی پەندی پێشینانەوە بۆچونی وایە ( پەندی پێشینان بریتیە لەڕستەیەك یان چەند ڕستەیەکی کورتی پوخت کەواتایەکی فراوانی هەیەو میراتێکی گەورەی نەتەوەیمانە و تا ئێستاش بۆپتەو کردنی قسە بەکار دەهێنرێت)(١٤). بەڵا ئەم بەڕێزە هەندێك لەپەندە کوردیەکان بەناپەسند دەزانێت، چونکە دژی ئافرەت وتراوە. بەڵام بەڕای من ئەو بەباشی لەواتاکانی حاڵی نەبوە ئەگینا میللەتی کورد

جیاواز لە چاو میللەتانی تری سەر ئەم گۆی زەمینە ڕێزی بۆ ئافرەت داناوەو تەنانەت لە بەشێك لە حکومەت ومیر نشینەکوردیە کانیشداپلەی سەربازی و ئەمیرایەتیشیان دراوەتێ. بەهەمان شێوەی نوسەرانی پێشوتر کەباسمان لێوە کرد بۆچونی ئەمیش سەبارەت بەپەندی پێشینان پێی وایە کەپەندی پێشینان لە ڕستەیەك یان چەند ڕستەیەك بەشێوەیەکی کورت و پوختە کەلە هەمان کاتدا لەتەنیشتی کورتی ڕستەکەیەوە مانایەکی فراوانی هەیە کەجیاوازی زۆری هەیە لە تەنیشت ئەندازەی وشەکان، کە ئەمەش مولکی باب و باپیرانمانە بۆمان بەجێماوە. کەلە هەر کاتێکدا کەهەستمان کرد بەلاوازی دەربڕینمان دەتوانین بۆ پتەو کردنی یان پڕمانایی قسەکانمان بەکاری بهێنین.

پاش شیکردنەوەی ڕای هەریەك لەوزاناو نوسەرو ڕوناك بیرو کەڵە شاعیرانە، دەتوانین ئێمەش بڵێین پەندی پێشینان وتەیەکی کورتی پڕماناو جوان و ڕازاوەیە، پوختەی تاقیکردنەوەو بەسەرهاتی ڕۆژانەی خەڵکە کەلە هەرقۆناغ و سەردەمێکدا، بەئاوێنەی ڕاستەقینەی ژیانی ڕابردوو، ئێستای میللەت دادەنرێت، بەزمانێکی ڕەوان و شێوازێکی جوان وبیرو باوەڕی چینەکانی ناو کۆمەڵگا دەردەبڕدرێت. ئەوەی جێگەی باسە لە ناوە ڕۆکی هەموو

پێناسەکاندا ئەوە مان بۆ دەردەخات کە شێوەی ژیانی مرۆڤ و چۆنیەتی هەڵسوکەوتی لەگەڵ خۆیی و دەوروبەرو ژینگەکەیدا هەرلەکۆمۆنی سەرەتاییەوە تادەگاتە ڕۆژگاری ئەمڕۆش بوون بە هەوێنی دەرکەوتن و دەربڕین و دەستکەوتنی سەدان و بگرە هەزاران پەندو ووتەی بەنرخ کە هەریەکێکیان بە شێوەیەك لە شێوەکان هەڵقوڵاوی کارو ڕەفتارو هەڵسو کەوتە ڕامیاری و کۆمەڵایەتی و ئابوری و فەرهەنگیە کانی کۆمەڵگە بوە بەگشتی، ئەوەی جێگەی سەرنج دانە بەشێکی زۆری پەندە کوردیەکان پەیوەست بوە بە شێوەی ژیانی کۆمەڵگەی کوردەواری و ئەو قۆناغەی تیایدا گوزەری کردوە هەرلەکاری هەرەوەزی و سەپانی و جوتیاری و کشتیاری و پینە دۆزی و کاری خمخانەو ئاژەڵداری و گڵکاری و پیشە سازیە سەرەتایەکان و تەنانەت زادەی کۆڕو کۆبونەوەی دیوەخانان و حیکایەت خوان و دەستەو تاخمە ڕۆشنبیرەکانیش بوە، ئەوەی جێگەی شانازی کردنە بەشێکی زۆری پەندەکان مۆرکێکی تەواو کوردەواریانەی هەیە و باوەڕمان وایە جگەلە کورد هیچ نەتەوەیەکی تر خاوەنی هەندێك لە پەندەکان نیە.

-----------  ----------  -----------

١- د.شوکریە ڕەسوڵ: ئەدەبی کوردی و هونەرەکانی ئەدەب ، ساڵی چاپ ١٩٨٩، لاپەڕە,١٧٤

٢- کەریم شارەزا: پەندی پێشینان لە شعری کوردیدا، لە چاپکراوەکانی کۆڕی زانیاری کورد، بەغداد ١٩٧٦، لاپەڕە ,٩

٣-محمد ابی بکر عبدالقادر رازی: امثال الحکم ، انتشارات، دانشتگها، تهران، ١٢٦٨ش، لاپەڕە ١٥.

٤- د.شوکریە ڕەسوڵ: ئەدەبی کوردی و هونەرەکانی ئەدەب ، ساڵی چاپ ١٩٨٩، لاپەڕە,١٧٤

٥- د. عزەدین مستفا ڕەسوڵ : لێکۆڵینەوەی ئەدەبی فۆلکلۆری کوردی، چاپی دووەم ، بغداد،١٩٧٩، لاپەڕە ,٨٥

٦- د. عزەدین مستفا ڕەسوڵ : لێکۆڵینەوەی ئەدەبی فۆلکلۆری کوردی، چاپی دووەم ، بغداد،١٩٧٩، لاپەڕە,٨٦

٧- د.شوکریە ڕەسوڵ: ئەدەبی کوردی و هونەرەکانی ئەدەب ، ساڵی چاپ ١٩٨٩، لاپەڕە,١٧٥

٨- کەریم شارەزا: پەندی پێشینان لە شعری کوردیدا، لە چاپکراوەکانی کۆڕی زانیاری کورد، بەغداد ١٩٧٦، لاپەڕە,١٠

٩-علا ئدین سجادی: دەقەکانی ئەدەبی کوردی ، لە چاپکراوەکانی کۆری زانیاری کورد، بەغدا، ١٩٧٩، لاپەڕە,١٠٦

١٠- عومەر شێخەڵا دەشتەکی: پەندی کوردی ، چاپی یەکەم، چاپخانەی کوردستان ، هەولێر ،١٩٧٢،لاپەڕە ,٢

١١- شێخ محمد خاڵ: پەندی پێشینان ، چاپی سێ یەم، چاپخانەو پەخشی سەردەم، سلیمانی ، ٢٠٠٠،لاپەڕە ٧.

١٢- حەمید گەردی : سامان و پەندی گەردی، چاپی دووەم، هەولێر،٢٠٠٦، ,١٢

١٣-نوخشە محمد ابراهیم: بیری ناپەسند لەپەندی پێشینانی کوردیدا، گۆڤاری سابات، ژمارە (٤،٥)،سلیمانی نەورۆزی ٢٠٠٧،لاپەڕە ٥٦٠.

## مێژووی سەرهەڵدانی پەندی پێشینان:-

ئەگەربمانەوێت بەشێوەیەکی وردو زانستیانە بگەڕێین بۆدەست نیشانکردنی هاتنەکایەو سەرهەڵدانی پەندی پێشینان دەبێ ئەوەلەبەرچاو بگرین کەهەر پەندەو مێژوو یەکی تایبەت بەخۆی هەیە، هەرکۆمەڵگایەك بگری پڕیەتی لە پەندو بەسەرهاتی خۆش و ناخۆش، بێ گومان ئەو بەسەرهات و کارە ساتانە کەسانی خاوەن تەجروبە و بەئەزمون وتویانە یان بڵاویانکردۆتەوە، لەڕاستیدا هەروائاسانیش نیە کەمێژووەکەیان دیاری بکرێت، چونکە هەرپەندەو لەقۆناغێکی جیاواز و بۆ مەبەستێکی تایبەت گوتراوە.

(پەند سەرەتا لەلێ وردبونەوەیەکی قوڵی ناودڵ و دەرو نێکی. پاکی تاکەکەسی یەوە چەکەرەی کردووە و سەری هەڵداوە، لە ژیانی ئاوەدانیەوە، بەهۆی مل ملانێی ژیانەوە، لەنەبوونەوە هاتۆتەبوون، بەهۆی بڵاو بونەوەو پەرە سەندنی بەنێو ڕۆڵەکانی میللەتدا تاموو چێژیان وەرگرتوە)[1]

کەواتا پەند بۆیەکەم جار بەهۆی ڕوداوێکەوە گوتراوە، کەبەدرێژایی مێژوو بەتێپەڕ بوونی کات بەسەرچونی ڕۆژگار ناوی

بێژەرە ڕاستەقینەکەی خۆی لەسەر زاری خەڵکی ترازاوە، لە ئەدەبی میللیەوە گۆڕدراوە بوە بەئەدەبی فۆلکلۆر.

(سەرچاوەی سەرهەڵدانی گشت پەندێك سەرەتایەکی هەیە ئەویش بۆ چیرۆك و کارەسات و ڕووداو و لێ قەو مانێك و ماڵ وێرانیەك دەگەڕێتەوە. ئەو هەموو ئارەزوەی کەلە ناخیاندا پەنگی داوەتەوە بەوتەیەکی کورتی پڕمانا بۆئەوەی مەبەستێکی زیاترو فراوانتر بدەن بەدەستەوە، هەربۆیە پەندوو قسەی نەستەق پەیوەندی بەباری تایبەتی کۆمەڵەوە هەیە لەڕوی مێژووی و سیاسی و ئابوری و کۆمەڵایەتی و ڕۆشەنبیریەوە)[٢]

پەندی پێشینان لە هەرقۆناغێکدا بێت مێژووی تایبەتی خۆی هەیە، کەواتا هەموو هەوڵدا نێکی مرۆڤ مێژوو یەکی دیاری کراوی تایبەت بە خۆی هەیە کە بە کارێکی تایبەتی لە مێژوو یەکی دیاری کراودا دە یکات، هەر لەبەر ئەمەشە ناتوانین لە مێژوو دایبڕین، چونکە پەند بۆیەکێك لە قۆناغەکانی ژیانی مرۆڤایەتی دەگەڕێتەوە.

(سەرچاوەی گشت پەندێك سەرەتایەکی هەیە بۆ چیرۆك و کارەسات، یاخودلێقەو مانێك) کەواتا کۆمەڵگا بەپلەی یەکەم شوێنی لەدایك بوون و سەرهەڵدان و هاتنە کایەی پەندە، جا ئەو کۆمەڵگایە تاچەند ئەوپەندانەلەناوی ڕەنگی دابێتەوە. تاچەندجێ

پەنجەی کەسانی خاوەن تواناو بە ئەزموون و بەهرەمەندی پێوەدیارە، بۆئەوەی ئەو پەندانە بنووسنەوەو کۆیان بکەنەوە و بیانکەنە بەرهەمی کۆمەڵگاکەیان کەنرخی زۆر گرنگی دەبێت بۆنەوەکانی دوای خۆی (پەند زادەی بیرو باوەڕی گەلە، وەدەست کردی کۆمەڵەیەکە، بێ ئەوەی بزانرێت خاوەنەکەی کێیە)

دەرکەوتن و دەستکەوتن و کورتی و پوختی و واتاداری پەندی پێشینان بەندە بە ئاستی تێگەیشتنی تاکەکانی هەرکۆمەڵگایەك کەتاچ ڕادەیەك پەندو ئامۆژگاری باوانیان کردۆتە یاساو ڕێسای ژیانیان و چۆن ڕەفتاریان لەگەڵ کردوە و چۆن نەوە دوای نەوە لە تێکدان و فەوتان و زەوت کردن پاراستویانە.

پەند:

(سەرەتا لەلێ وردبونەوەیەکی قوڵی تاکەکەسی چەکەرەی کردوەوسەری هەڵداوە، لە ژیانی ئاوەدانیەوە، لەنەبونەوە هاتۆتەبوون، بەهۆی بڵاو بونەوەو پەرەسەندن بە نێو ڕۆڵەکانی وڵاتدا زاخ و پێزیان وەرگرتوە)[٣]



( بۆیەکەم جار بەهۆی ڕوداوێکەوە گوتراوە، بەدرێژایی ڕۆژگار، ناوی بێژەرەکەی لەسەرزاران ترازاوە، لە ئەدەبی میللیەوە بۆتە ئەدەبی فۆلکلۆر، کەبوەبەپەند)

پەندی پێشینان خۆی لەڕوداوێکەوە یان چیرۆکێکەوە سەرچاوەی گرتوە، بۆتە پەند یان بڵێین پەندی لیّ دروست بووە، ئەم پەندەش لەسەر زاران ترازاوە بە هەموو ناوچەکاندا بلاّ و بۆتەوە وەك و ئامۆژگاریەکی لێهاتوە بۆکەسی قسە کەرو گوێگر، پەندی پێشینان لەبەر بەهێزی و شێوازی ڕێکخستنی زۆر بەخێرایی پەرەی سەندووە بەناو خەڵك بلاّو بۆتەوە و ئەم پەندانەش لە ووتە بەنرخەکانی باب و باپیرانمانەوە کەوا بەهۆی ئەزمۆن و دنیا دیدەی خۆیان دایان ڕشتوە و سەری هەڵداوە و بەناو خەڵکدا بلاّو بۆتەوە.

دەشێت بڵێین دیاری کردن و دۆزینەوەی کات و سەردەمی هەرپەندێکی کوردی بۆتوێژینەوەیەکی ئاوها کارێکی ئەستەمە، چونکە مێژووی پەندەکان بۆچەندین سەدە بەرلە ئێستا دەگەڕێتەوەو بەهۆی نالە باری هەلو مەرجی سیاسی و ئابوری و کۆمەلاّیەتی ئەو قۆناغەی گەلی کورد نەتوانراوە پەندەکان خاوەندارێتی بۆ دیاری بکرێت، وەنە بێت ئەم نەبوونی خاوەندارێتیە تەنها کێشەی

ڕۆشنبیرانی کورد بێت بەڵکو کێشەی هەموو نەتەوە زیندوەکانی تریشە کەتا ئێستا نەیانتوانیوە مێژووی ڕاستەقینەو خاوەنی ڕەسەنی پەندەکان بدۆزنەوە.

------------ ------------- ---------

١-عومەر شێخەڵا دەشتەکی: پەندی کوردی، بەرگی دووەم، چاپخانەی وەزارەتی ڕۆشەنبیری، هەولێر ١٩٨٠ ، لاپەڕە٦- ٧,

٢-د. شوکریە ڕەسوڵ : ئەدەبی فۆلکلۆری کوردی، چاپخانەی زانکۆی سەلاحەدین، ١٩٨٤، لاپەڕە٦٤.

٣-شێخ محمد خاڵ: پەندی پێشینان، چاپی چوارەم، چاپخانەی شڤان، ٢٠٠٧، لاپەڕە٨.

## خاسیەتەکانی پەندی پێشینان:

پەندی پێشینان زۆر جار بەشێوەیەکی گشتی لەڕاستیەکی ئاشکرادەدوێ کەبە شێوەیەکی سادە وکورت و ئاسان و ڕێك و پێك دارێژراوە تاکو زۆر ترین کەس تێبگەن.

بەڕای هەندێ لە زانایانی فۆلکلۆر پەندی پێشینان دوو خاسیەتی پێوەدیارە ئەوانیش( لە شێوەی فێرکردن و پەندو ئامۆژگاریدان، هەروەها کورت بڕی و حەست و خۆلی لەدارشتن دا)[1]

ئەم دووخاسیەتەبونەتەمایەی بڵا وبوونەوەی بەناو هەموو چین و توێژەکانی جیهان و بەکار هێنانی لە ئاخاوتنی ڕۆژانەیاندا. فۆلکلۆرناس( بۆگز) دەڵێ پێویستە دوو مەرجی سەرەکی لەو ئەدەبە فۆلکلۆریەدا هەبن ئەوانیش ( پێویستە قسەو پەندی زیندوبن و بۆ سەردەمی ئەمرۆمان بەکار بێت، دیسان پێویستە وەکو میراتێکی نەتەوەیی بێ لە پشتێکی کۆنەوە بۆ پشتێکی نوێ بەجێ مابێ)[2].

بێ گومان پەندی کوردیش وەکو هەموو گەلانی تر هەندێ خاسیەتی تایبەت بەخۆی هەیە لەوانە (پەندی کوردی بەڵگەنامەو ئاوێنەی مێژووی هەزاران ساڵەی نەتەوەی کوردەکە زمانی ڕەش و

ڕووت و چەو ساوەو ڕەنج کێشی گەلەکەمانەو کۆمەڵە ئامۆژگاریەکی وێژەیی و گەنجینەیەکی هەمیشەیی و بەکەڵکە)[٣].

کەواتا دەتوانین بڵێین زۆر بەی پەندە کوردیەکان وەك پێوەرێك وان بۆ پێوانەی ڕادەی هۆشیاری و کارامەیی و لێهاتویی ڕۆڵەکانی نەتەوەکەمان، دیارە ئەمەش بۆ بیر مەندی باو باپیرانمان دەگەڕێتەوە، لەلایەکی ترەوە ئەم پەندانە لەزۆر بواردا بونەتە ڕابەروو ڕێ نیشاندەری خەڵك و چارەسەری باش بۆ کێشەو ئاستەنگەکانی ناو کرمەڵگای کوردەواری دۆزیوەتەوە، چونکە لە پێش دانانی یاساو دەستور لەکۆمەڵگای مرۆڤایەتی دا وەك پەندی یاسا کاریان پێکراوە و لە دوایدا بوون بە پەندی دەستورو یاسایی میللەتان بۆ نمونە( یاسای ڕۆمانی لەسەر پەندو قسەی نەستەق دامەزراوە و لایەنێکی گەورەش لەیاسای گشتی ئینگلیزی تا ئەمڕۆش لەسەر گەنجینەی ئەو پەندی پێشینانانەی کەدەماو دەم لە پشتی کۆنەوە بۆیان ماوەتەوەو دامەزراوە)[٤].

( بەگشتی پەندی کوردی وشەو پەیڤی کوردی خۆی ئەم پەندە دەتوانین سودێکی زۆری لێ وەر بگرین بۆ داڕشتن و هەڵسەنگاندنی وشەی تازەی ڕەسەنی کوردی)[٥].

خاسیەتێکی تری پەندی پێشینان ئەوەیە کەوشەو پەیڤی ڕەسەنی کوردی دەگرێتە خۆی و بەزمانی زکماکی بێژەرەکەی نوسراونەتەوە لەناوەڕۆکێکی ئاشکرا دەستکاری نەکراوە، ئەگەر دەستکاریش کرا بێ ئەوا تەنها گۆڕانکاری لەڕوخساردا ڕووی داوە کەوشەیەك لە جیاتی وشەیەکی تر بەکار هاتووە ئەگینا ناوەڕۆکەکەی هەر هەمان واتای هەیە.

ئەمەش ئەو ڕاستیە دەسەلمێنێت کەبەشی هەرەزۆری پەندە کوردیەکان پەندی کوردی ڕەسەنن و لە میللەتانی تر وەرنەگیراون و زادەی خەم و دەردو ناخۆشیەکانی کورد خۆی بوە.

(پەندی پێشینان گەلێك تاقی کردنەوەی بەسودمان نیشان دەدات ئەم پەندانە هەریەکە بەرهەمی تەجروبەیەکن)[٦].

کەلەڕۆژگاری ڕابردووی باب و باپیرانمانەوە بۆمان بەجێ ماون لە ئەنجامی ئەو ڕوداوانەی کەبەسەریان هاتوە لەڕۆژگارە خۆش وناخۆشەکان، بەهۆی ئیش و کارەکانیانەوە لە کشتوکاڵ و ئاژەڵداری و بوارەکانی تری ژیانیان بۆیە دەکرێت ئەو پەندانە ببنە ڕێگە نیشاندەرێك بۆ ئێمە لە کاروو بارەکانی ڕۆژانەماندا.

( زۆربەی پەندە کوردیەکان پێوەرن بۆپێوانەی ڕادەی هۆشیاری وکارامەیی و لێهاتویی ڕۆڵەکانی نەتەوەیی کەزۆرجاربۆتەڕابەری ڕێ پیشاندەری خەڵك)(٧) .

بەڕای من پەندی کوردی یەکەم جار کەسێك بە هۆی ڕوداوێکەوە گوتویەتی و بەدرێژایی مێژوو ناوی بێژەرەکەی نەماوەو لەئەدەبی میللیەوە بووە بە ئەدەبی فۆلکلۆر کە بۆ پەند ئەم خاسیەتانەی تیا بەدی دەکرێت.

( سەرچاوەی پەیدا بوونی پەند ڕاستەو خۆ پەیوەندی بەڕووداوەکانی ناو کۆمەڵەوە هەیە، کەڕۆڵیان گێڕاوە لەڕووی ئابوری و کۆمەلا یەتی و ڕامیاری کەبەسەر نەتەوەکەماندا هاتووە)(٨) .

( پەندی واهەیە سەردەم لەدوای سەردەم بەدرێژایی مێژوو ڕوداوەکەی لەیاد نەکراوە، پەند هەیە ڕاستەو خۆ لە ڕوداوەکەو کاتی ڕووداوەکەدەگەیت، پەند هەیە تایبەت بەچینێك یان توێژێکە، ڕووداو هەیە چەند پەندێکی دراوەتەپاڵ، پەند هەیە لەدەربڕین وواتادا لەپەندی ترنزیك دەبێتەوە بەلام بۆ دوو ڕوداوی جیاواز وتراوە)(٩) .

هەموو ئەمانەی کەباسمان کرد خاسیەت گەلێکن لە پەندی کوردی بەڕوونی بەدیار دەکەون .

پەراوێزەکان:

١-کەریم شارەزا: پەندی بەراورد کاری، چاپخانەی سەمیر امیس،بەغدا، ١٩٨٣، لاپەڕە ٦,

٢- کەریم شارەزا: هەمان سەرچاوە، لاپەڕە ٨,

٣- زمان و ئەدەبی کوردی ، پۆلی سێ یەمی ناوەندی، لاپەڕە ١٥٣-١٥٤,

٤-کەریم شارەزا: هەمان سەرچاوە، لاپەڕە ٩.

٥-د. عیزەدین مستەفا ڕەسول: لێکۆڵینەوەی ئەدەبی فۆلکلۆر ، چاپخانەی زانکۆی سلێمانی، چاپی دووەم، سلێمانی ، ١٩٧٦، لاپەڕە,٨٢

٦- د. عیزەدین مستەفا ڕەسول: هەمان سەرچاوەی پێشو، لاپەڕە ,٨٣

٧-زمان وئەدەبی کوردی : پۆلی سێیەمی ناوەندی ، بەڕێوەبەرایەتی پرۆگرامەکان، چاپی دوەم ، ٢٠٠٨ن لاپەڕە,١٦٨

٨-د. شوکریە ڕەسول : ئەدەبی فۆلکلۆری کوردی، چاپی یەکەم ، دەزگای مویزیك، هەولێر، ٢٠٠٨، ,٦٧

٩-عومەر شێخلا دەشتەکی: پەندی کوردی، چاپی یەکەم ، بەرگی چوارەم، چاپخانەی پاك، هەولێر، ٢٠٠٢، لاپەڕە ٦٠.

## جیاوازی پەندی پێشینان لە گەڵ قسەی نەستەق

سەرەتا دەبیت بزانین قسەی نەستەق چۆن ناسراوە بە چ شێوازێك پێناس کراوە، قسەی نەستەق( بریتیە لە ئاخاوتنێکی چڕوپڕی مانادار کە دەخرێتە پاڵ کەسێك، یاخود نوسەرێك یان مرۆڤێکی ناودار، قسەی نەستەق خاوەنەکەی دیارە کەدەزانرێت کێ وتویەتی، شێوەی پەندی هەیە، بەلاّم لە هەمان کاتیش وەك ئەو نیە، هەرمرۆڤیك بیەوێت لە رێگەی قسەی نەستەق یاخوت بەهۆی هەموو بیرو ئەندێشەو فەلسەفەی خۆی لەرستەیەکدا پوخت یاخود کۆکراوەتەوە بەچەشنێك وەکو ئاوێنە و ئەو بیرەی کەلەناخیدا هەڵیگرتوە تێیدا ڕەنگ بداتەوە)[1]. کەواتا قسەی نەستەق بەرهەمی داهێنراوی مێشکی تاکە مرۆڤێکە کە ئەو مرۆڤە بیر ێکی زیندوو ترو کامڵتر و بەهێزتری لە چاو کەسانی تری ناو کۆمەڵگادا هەیە، مامۆستا (عەلائدین سجادی ) لە بارەی قسەی نەستەقەوە دەڵێت:-(نەستەق بەمانای ئەنتیکەو نایاب، والێك ئەدرێتەوە کەقسەی نایاب و ئەنتیکە، لەپڕمانایی ناونراوە، چونکە ئەو چەند وشەیە ئەوەندە بەماناو ئەنتیکەیە بۆیە پێی دەڵێن قسەی نەستەقە

واتا ئەو جۆرە وشانە دانسقەیە کەم کەس توانای دەربڕینیان هەیە)[٢].

قسەی نەستەق زیاتر ئەو قسەو ڕستانە دەگرێتەوە کەجیاوازن لە گفتوو گۆی ئاسایی ڕۆژانەی خەڵك و مانایەکی زیاترو بە پێز تر دەبەخشن و ئەگەرچی لە ڕۆژانەشدا زۆر بەکار دێت، بەڵام بەڕادەیەکی کەمتر لە چاو قسەی ئاسایی و پەندی پێشینان.

بەهەمان شێوە مامۆستا ( علائدین سجادی) ئاماژەبەوەش دەکات و دەڵێت: -( ئەم قسەی نەستەقەش وەکو پەندی پێشینانە چەند وشەو ڕستەیەکی کەمن، بەڵام ماناکانیان زۆرزیاترو بەهێزترو قوڵترو گەورە ترن لە وشەو ڕستەکان، وەهەروەها ئەمانەش لە زەمانێکی کۆنەوە لەناو زمانی کوردیدا دروست بوون، بەڵگەن بۆڕەسەنی و کۆنی زمانەکەمان، بەڵام ئەوەی جیای دەکاتەوە لەپەندی پێشینان ئەوەیە کەقسەی نەستەق خاوەنی دیارەو ون نەبوە). قسەی نەستەق چەند وشەو ڕستەیەکی کەمن بەڵام ماناکانیان زۆرن، کەچی مامۆستا (علائدین سجادی )هەرچەندە بەشێوەیەکی ڕاستەو خۆ ناوی قسەی نەستەقی نەناوە لەو قسە نەستەقانەی کەلە بابەتی (کوردو فەلسەفە)داکردونی بە نمونەبۆلێکۆڵینەوەی فیکری فەلسەفەی کورد، بەڵام دەتوانین قسەکانی بکەینەدەروازەیەك بۆ پێکەوە بەستنی

قسەی نەستەق و فەلسەفەکە ئەمە خۆی لەخۆیدا یەکێکە لە ئامرازە سەرەکیەکانی جیاکردنەوەی پەندی پێشینان و قسەی نەستەق هەر لەم ڕوە وە مامۆستا (جەمال بابان) بەشێوەیەکی زانستیانە ئەم دوانەی جیاکردۆتەوە و دەڵێت:-( پەندی پێشینان خاوەنەکەی دیار نیە و ناشزانرێت کێ وتویەتی بەڵام قسەی نەستەق خاوەنەکانیان دیارو ناسراون وەك قسەنەستەقەکانی( یەزدان )لە قورئانی پیرۆزدا یان وەك ئەوانەی (پێغەمبەر)ی ئیسلام لەفەرمودەکاندا کەهەریەکەیان بۆ بابەتێك وتراون یان وەك وتەکانی (خولەفاکانی ڕاشدین) یان وەك وتەکانی ( ئیمامی شافیعی) یان وتەکانی (ئەفلاتون) کەدەڵێت: (مرۆڤ لەکاتی نەبونیدا تاقی دەکرێتەوە)[٣].

ئەوەی شایەنی باس کردنە مامۆستا (جەمال بابان) تەنیا دیار بوون و دیار نەبوونی خاوەنی پەندو قسەی نەستەقی کردوەبە بناغەی جیاکردنەوەدادەنێت. ئەوەی شیاوی باسکردنە لێك چونی زۆر هەیە لە نێوان قسەی نەستەق و پەندی پێشینیاندا بەڵام بەتەواوەتی لێك جودا نەکراونەتەوە، لێکۆڵەران لەلێکۆڵینەوەکانیاندا هەردوو بابەتیان پێکەوە باسکردوە، زۆر بەی جار لەم نێوەندەدا خاوەنەکان ونکراون بەتایبەت کە خۆمان باش دەزانین قسەی نەستەق خاوەنی خۆی هەیە موڵکی کەسەکانە نەك کۆمەڵگا، بۆیە زۆربەی پەندەکانی پێشینان

قسەی نەستەقیان لە خۆیاندا وون کردوە و بە جۆرێك ئاوێتە بوون کە ئاسان لەیەکتر جیا نەکرێنەوە و خەریکە قسە نەستەقەکان بێن بە بەشێك لە پەندی پێشینان، هەر بەناوی ئەوەناوە لەقەڵەم دەدرێن. لە گەڵ ئەوەشدا خاڵی جیاواز بەدی دەکرێت لە نێوان پەندی پێشینان و قسەی نەستەق

ئەوانیش ئەم خاڵانەن:-

١- قسەی نەستەق خاوەنەکەی دیارو ئاشکرایە، بەڵام پەندی پێشینان خاوەنەکەی دیار نیەو نازانرێت کێ خاوەنەکەیەتی کێ گتویەتی). بۆیە پەندی پێشینان دەدرێتە پاڵ میللەت و قسەی نەستەقیش دەدرێتە پاڵ کەسێکی دیارەوە بەواتایەکی تر پەندی پێشینان هەمووکەس خۆی بەخاوەنی دەزانێت، بەڵام قسەی نەستەق قسەی کەسێکی دیارەو هەر ئەو خۆی بەخاوەنی دەزانێت.

٢- پەندی پێشینان لەناوەڕۆکدا لەقسەی نەستەقەوەنزیکە، بەڵام هیچیان ناتوانن جێگەی ئەویتریان بگرنەوە، ئەگەر سەرنج بدەین بەووردی ( قسەی نەستەق کەمتر مەبەست ئەدات بەدەستەوە، واتا ماناکردنەوەی زۆر ڕۆشن نیە هەمووکەس لێی تێناگات و لە قسەکانی خۆیدا دەرناکەون)[٤]. لێرەدا مامۆستا (جمال بابان) ئاماژە

...ەی نەستەق دەکات بەو ش... هەموو بوارێك یاخود لە

هەندێك قسەی نەستەق دا ماناكەی ڕون و ئاشكرا نیە ئەگەر خوێنەرێكی زیرەك نەبێت ناتوانێت لە واتاكەی تێبگات یاخود بەجوانی شیبكاتەوە.

٣- لەبەر جوانی و پاراوی و توانای گونجانی لەگەڵ هەموو سەردەمێكدا، پەند بۆتە بەرهەمێكی گشتی و تێكەڵ بە خوو ڕەوشت و ئاداب و ویژدانی كۆمەڵگابوە و لەلایەن هەموو چین و دەستەیەكەوە بەكار دەهێنرێت، بەڵام قسەی نەستەق بەتایبەتی ئەوانەی خاوەنەكانیان دیارن زیاتر لەناو دەستەیەكی دیاری كراودا ماونەتەوە .

٤- بەشێوەیەكی گشتی( پەند خۆی لەڕەوانبێژی دەدات و بەئاسانی دەتوانێت ڕەگەزەكانی ڕەوانبێژی وەكو ڕونبێژی و جوانبێژی و لێكچون دركەو هەندێك مەبەستی ئەدەبی تر وەكو هەجوو، شانازی موبالەغەكردنی تێدا دەست نیشانبكرێت، بەڵام قسەی نەستەق بایەخ بەولایەنانە نادات، بەڵكو زیاتر دەیەوێت بەبابەتێك، تێڕامانێك دەربخات و ڕەگەزی خەیاڵ ئەفسانەی تێدا بەدەر كەوێت)[٥] .

٥- پەند بەرهەمێكی ئەدەبی بەربڵاوە لەناو ڕۆڵەكانی میللەت دا و زۆربەی خەڵك بیستویەتی و زۆرجاریش لەدانیشتن و كۆڕو كۆبونەوەكاندا وەك پاڵپشتی بۆقسەكانیان بەنمونە دەیهێننەوە،

هەرچی قسەی نەستەقە لەناوژمارەیەکی کەمی خەڵك دا بەربڵاوەو هەمووکەس قسەی نەستەقی نەبیستوە و کەم جاریش دەکرێتە پاڵپشت بۆقسە کردن.

------------------------- ------------ ----------

پەراوێزەکان:

١- د.موحسین ئەحمەد عومەر: فەرهەنگی زاراوەی ئەدەبی ، چاپی یەکەم، لە بلاوکراوەکانی ئاراس، هەولیر، ٢٠٠٥، لاپەرە,٨

٢- عەلائدین سجادی: دەقەکانی ئەدەبی کوردی، چاپخانەی کۆری زانیاری کورد، بەغداد، ١٩٧٩، لاپەرە ١٥٨- ١٥٩.

٣-جەمال بابان: قسە هەزارە دوانی بەکارە، لێکۆڵینەوەیەکی پەندی پێشینان، دەفتەری کوردەوارە،بەرگی یەکەم، بەغدا، ١٩٧٠,

٤- د. عزەدین مستفا رەسوڵ: ئەدەبی فۆلکلۆری کوردی، چاپی دوەم، چاپخانەی زانکۆی سلێمانی، ١٩٧٩،لاپەرە ٥,

٥- نجم خالید ئەڵوەنی: پەندو قسەی نەستەقی کوردی ، شاری خانەقین، چاپی یەکەم، ٢٠٠٨، لاپەرە ٦٦.

## شیکردنەوەو لێکدانەوەی پەندەکان

دەربەندیەکان بەهۆی ئەزموون و کارامەیی و شارەزاییانەوە خاوەنی گەوهەرێکی زۆرو زەوەندو بەنرخن لە پەندی پێشینان و ووتەی نەستەق بەڵام نالەباری هەلو مەرجی سیاسی و کۆمەڵایەتی ناوچەکەو گەشەکردنی خێرایی ژیان و کەمی ژمارەی ئەوانەی خوێندەواربوون بەشێك لەو پەندو ووتە نەستەق و بەنرخانە لەناوچوون و هەندێکیشیان بەهۆی نە نوسینەوەیان و تۆمارنەکردنیان لەبیر چونەتەوە و نەگەیشتونەتە دەست وەچەی نوێ، هەروەها ووتە نەستەق و بەنرخەکانیش جگە لە هەندێکیان نەبێت ئەوانی تر لەگەڵ مردنی خاوەنەکانیان وون بوون و فەوتاون بەمەش گەلی کورد سەروەتێکی گەورەی لەپەندی پێشینان و ووتەی نەستەقی لەکیس چوە.

ڕەنگە ڕاڤەو لێکدانەوەی پەندەکانی پێشینان لە کەسێکەوە بۆ کەسێکی تر جیاواز بێت هۆی ئەم جیاوازیەش بۆچڕی و پڕی و پوختی پەندەکان بگەڕێتەوە کە هەمووکەس نەتوانێت لێکدانەوەو ڕاڤەی دروستیان بۆ بکات.

هەرچەندە زۆربەی پەندەکان تارۆژگاری ئەمڕۆش لەکۆڕو دانیشتنی دیوەخان و ماڵان و شوێنە گشتیەکاندا وەك نمونە

دەگوترێتەوە و دەکرێنە پاڵ پشت بۆ ڕاو بۆچونێکی دیاری کراو، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا پەندەکان لەهەلو مەرجی دواکەوتویی کۆمەڵگەو کەمی خوێندەواری گوتراون و هۆنراونەتەوە و زۆربەشیان بۆکاروباری جوتیاری و سەپانی و کاری هەرەوەزی و ئاژەڵداری و لەڕێوڕەسمە کۆمەڵایەتیەکانی شایی و زەماوەند و پرسە و هەروەها لەڕووداوە کۆمەڵایەتی و مێژوویەکاندا گوتراون و ڕێك خراون هەربۆیە هەندێکیان لەگەڵ هەلو مەرج و بارو دۆخی ژیانی ئێستای کۆمەڵگەدا ناگونجێن و ڕێك ناکەون تەنانەت دەتوانین بڵێین هەندێکیان هەربەشیاو نازانرێن، بەواتایەکی تر بەشێك لەپەندەکان گوزارشتی کردوە لە شێوەی ژیانی چەندین سەدە بەرلە ئێستا و بۆ ئەو سەردەمە گوتراوە نەك بۆئێستا.

بۆنمونە پەندی( ژن شەرمن شاریك دیاریك ، بەڵام پیاو شەرمن شانەیك نیاریك)، ئەم پەندە لەسەردەم و هەلو مەرجی دواکەوتویی کۆمەڵگە بەگشتی و توێژی ژنان بەتایبەتی گوتراوە و ناکرێت و ناشێت بەو پەندە مامەڵە لەگەڵ ژنی ئەم سەردەمە بکەین، چونکە ژنان لە ئێستادا خاوەنی چەندین کۆمەڵەو ڕێکخراوی تایبەت بەخۆیانن و ئاوێتەی هەموو پێشکەوتنەکانی کۆمەڵگە بوون و هەزاران شاعیرو نوسەرو خەڵکی بلیمەتیان تیا هەڵکەوتوەو بەشدارن

لە بەڕێوەبردنی وڵات و دەستیان گەیشتۆتە ناوەندەکانی بڕیار دانەوە، هەرچەندە ئەگەرلێکدانەوەی قوڵ بۆووشەی (شەرمن)ی ناوپەندەکە بکەین ڕەنگە بگەینە ئەو واتایەیی کەمەبەست لێی ئەوە بو بێت کە پێویستە ژنان ڕێك پۆش و ڕێك و پێك و خاوەنی کەسایەتی بەرزو پاك بێت.

بەڵام کەسەیر دەکەیت بەشێکی زۆری ئەو پەندو ووتانە کە سەدان ساڵ بەر لە ئەمڕۆ لەلایەن پیاوە بیرمەندوو بەئەزمونەکانەوە وتراون کەچی لەگەڵ ڕۆژگاری ئەمڕۆدا زۆرگونجاون و خەڵکی لە کارو باری ڕۆژانەیان یان لە کۆڕو کۆبونەوەکانیان وەك بەڵگە بۆ پشت ڕاست کردنەوەی قسەکانیان بەکاریان دەهێنن بۆنمونە"

﴿سەردوو وەران لە مەنجەڵێك نێ کولێك﴾ یان ﴿زانایك بایك لەت باشترە لەوەی نەزانیك خزمەتت بکەیك﴾

## ﴿ دایکەی بوینەو دوێتەی بخوازە،
## دڵت هیچ نەکەیك پەرەوازە ﴾

واتای ئەم پەندە کچ ئەچێتەوە سەرهەمان ڕێبازو ڕێچکەی دایکی خۆی، چونکە دایك بەرپرسیاری یەکەمە لەپەروەردەکردنی منداڵدا بەتایبەت کچ، لەبەرئەوەی لەکۆمەڵگای کوردیدا بە شێوەیەکی زۆر هەستیار مامەڵە لەگەڵ کچان دەکرێت و زۆر بەوردی لەلایەن دایك وباوکەوە چاوەدێری دەکرێت کەمتر لە کوڕ ئازادی پێ بەخشراوە، بەتایبەتیش دایك بەبەرپرسیاری یەکەم دائەنرێت لەپەروەردەکردنی کچدا، بۆیەکاتێك کوڕێك بەنیازە ژیانی هاوسەری پێك بێنێت لەلایەن هاوڕێو دۆستەکانیەوەئەم قسەیەی ئاڕاستەدەکرێت بەڕاستەو خۆ یان ناڕاستەوخۆ، یانیش ئەگەر دایك وباوك ماڵی کچەکەیان بەدڵ نەبو یان ئەو بنەماڵە یان لاپەسند نەبوو ئەوا بەکوڕەکە ئەڵێن دایکە بوینەو دوێتەی بخوازە، واتا سەیری خوڕەوشتی دایکی بکە ئینجا داوای کچەکەی بکە .

## ﴿ خەسویلە دەوەل تومە وەویلە گویّت لەی بووك﴾

ئەم پەندە تانەو تەشەرێکی ناڕاستەو خۆیە لە کەسێك گیراوە بنچینەی پەندەکەش لەوەوە هاتوە کاتێك بوك لە ماڵە غەزورانی توشی هەڵەیەك دەبێت غەزوری ڕاستەو خۆبوکەکە لەو هەڵەیە ئاگادارناکاتەوە نەوەکا بەخۆیدا بشکێتەوە یان دڵگران بێت ، هەربۆیە گوتراوە(خەسولە لەگەڵ تومە بوکە گویّت لیّ بێت)

واتا پەلارەکە لەخەسو گیراوە بەلاّم ئامانج لیّ ی ئاگادار کردنەوەی بوکەکە بوە تاهەڵەی وادوبارە نەکاتەوە.

# ﴿گالە لە گێرەی گاوس خوەی سەری ژان کەیك﴾

ئەم پەندەش لەسەردەمی کشتوکاڵ و ئاژەڵداری وتراوە ، دیارە کەکاتی خۆی جووت و جوتیاری بەگا دەکرالە گوندەکانی کوردستان، چونکە بۆئەو سەردەم باشترین کەرەستەی کشتوکاڵی بوو، باب و باپیرانمان زۆر بەجوانی ئەو گایەیان پەروەردەکردبوو کەلەکاتی جووت کردندا زەویەکەی بەباشی دەکێلا ، بەلام مەبەستمان لە(گاوس) خۆراك و ئالیکی ئاژەڵەکەیە واتا ئەو گایەی کە لەبن نیرا خەریکی جووت کردنە ، وتویانە لەکێلانی ئەو زەویەی کەبۆ بەرهەم هێنانی ئەو ئالیکە کراوە کە بۆخۆیشی بووە زۆر بەجوانی نەی کێلا وە، بەلام ئەم پەندە مەبەستی زیاتر بۆمرۆڤەکانە کەهەندێ لەمرۆڤەکان لەکاری خۆیان سەریان ژان دەکات و حەزبەکاری خۆیان ناکەن بەلام بۆ یەك ئافەرینێك ئامادەن باشترین ئیش بۆخەڵك بکەن بەبێ ئەوەی هەست بەماندوو بوون بکەن.

# ﴿خەت چەفت هالە بن سەر گای پیر﴾

لەسەردەمی کۆندا کێڵانی زەوی بەگا ئەنجام دەدرا، بەزۆریش بەدووگا پێکەوە ئەو کارە دەکرا، ڕەنگە یەکێك لەگایەکان بەتەمەن و پیر بوبێت و نەیتوانیبێت بە باشی کاری کێڵان ئەنجام بدات و سەرەنجام خەتی کێڵان و جوتەکە خوار دەردەچوو، مەبەستی ڕاستەقینەش لەگوتنی ئەم پەندە ئەوەیە کاتێك کارێکی خراپ لەناو کۆمەڵگە ڕوودەدات کەسێکی بە تەمەن گەورە لەو کارە خراپە بەرپرسیار بوە جاخۆی ئەنجامی دابێت یان بە ئاماژەو گوفتاری ئەو ئەنجام درابێت، هەربۆیە پیاوە ژیرەکان گوتویانە

( خەتی خوار لە ژێر سەری گای پیرە)، واتا ئەو کارە خراپەی کە ئەنجام دراوە ئەگەر مندا لێکیش ئەنجامی دا بێت ئەوا پیرێك یان بە تەمەنێك لە پشت ئەو کارە خراپەوەیە.

## ﴿ تەقرە چاك بوك بەشان خاوەندیەوە دبوك ﴾

لێکدانەوەو شیکردنەوەی ئەم پەندە ئەگەر شتێك چاك بێت خاوەنەکەی فرێی نادات، ئەم پەندە لەوەوە سەرچاوەی گرتوە یان بەو کەسە وتراوە کە شتێکی خەڵکی لایە خەریکە بەکاری بێنێت بۆکارێك بەڵام پێشوتر فرێ دراوە یان خاوەنەکەی وازی لێهێناوە لەبەرامبەردا پێی دەڵێن ئەگەر چاك بوایە خاوەندی فرێی نەئەدا، بەشێوەیەکی گشتی بەو شتانە دەوترێت کەلەلایەن خاوەنەکانیانەوە پشت گوێ خراون یان بەکار نایەن تۆ بچیت دوبارە خۆتی پێوە خەریك کەیت بەکاریان بێنیتەوە لەبەرامبەردا ئەم قسەیەت ڕوو بەرو دەکەنەوە تا واز لەوکارە بێنیت.

## ﴿خوەت ئەڕا بورەپیاو بەکوشت بای دویشیك بەمەرگ خوا مردیە﴾

لێکدانەوەی ئەم پەندە ئەوە ئەگەیەنێت یارمەتی هەموو جۆرە پیاوێك نەدەیت، چونکە جاری واهەیە لەسەر پیاوێك بەجواب دێیت ئەتەوێت پشتی بگریت هاوکاری بکەیت، بەڵام پیاوەکە پێی نازانێت یان ڕوبەڕو پێت ئەڵێن خۆخۆم دەستم هەیە یان بۆخۆم ئەی کەم تو کارت پێوەی نەبێت لەو کاتەدا لەجیاتی چاکەو پیاوەتی پیاو خراپیش ئەبێت لەسەر ماڵی خۆتەوە، ئەو جۆرە کەسانە لەکۆمەڵگادا هەن وەلە ئیشو کارەکانی ڕۆژانەشماندا توشی چەندا کەسی وادەبین بۆیە ئەو پەندە هەرزیندوە لەناو خەیاڵ وزاکیرەی مرۆڤدا ڕۆژانە بەسەرزارماندا دێت، بۆیە پێشینان جوانیان وتوە بەو جۆرە پیاوانە.

# ﴿شەڕ کەری ئاشتی دوویایی لەویرت بووك﴾

ئەم پەندە لەسەر هەڵوێستی ئەو کەسانە وتراوە لەکاتی ناخۆشیدا یان لەکاتی کارەساتدا یان لەکاتی شەڕوناخۆشیی نێوان بنەماڵەکاندا لەسەرکێشە کۆمەڵایەتیەکان بەردەوام پێویستە لەسەرخۆبن زوو هەڵ نەچن لێبوردەبن بەرامبەرکەسەکان، چونکە هەرچەندی تورەبیت یان دەنگ بەرزکەیتەوە لەکێشەکاندا یان کەسێکی شەڕانگێز بیت دواجار هەرئەبێت پەشیمان بیتەوە داوای ئاشتی بکەیت لەگەل بەرامبەرەکەت بۆیە وتراوە ئەگەر شەڕکەری دڵنیاش بە ئاشتی هەیە دەبێت لەبیرت بێت سنورەکان زۆر نەبەزێنیت، چونکە دواجار هەردەبێت ئاشت بیتەوە لەگەڵ بەرامبەرەکەت، بۆیە دەبێت لەکاتی ڕوداوەکان لەسەرە خۆو هێمن بیت وگیانی لێبوردەیت هەبێت، خوداش ئەو جۆرە کەسانەی خۆش دەوێت هەرلەسەر ئەم مەفهومەش ووتەی ناودارێك دەهێنینەوەکەدەڵێت:( مرۆڤ واتا هەڵوێست) واتامرۆڤ بە هەڵوێستەوە جوانە.

## ﴿ تێریکایی مانگ سەرلە ئیوارە دیارە ﴾

شیکردنەوەو لێکداوەی ئەم پەندە ئەوە ئەگەیەنێت ئەگەر دووبنەماڵە ناخۆشیەك بکەوێتە نێوانیان ئەوا چەند کەسانێك لەپیاو ماقوڵی گوند بچە نێوانیان بۆئەوەی ئاشتیان بکەنەوە بەڵام کەسێك لەو دوبنەماڵەیە قسەیەکی ناخۆش بکات کە بۆنی ناخۆشی لێبێت ئەواله بەرام بەردا ئەم پەندە دەوترێت واتا ئەم ئیشە ڕێك ناکەوێت، چونکە هەرلەسەرەتاوە دیارە حەزیان لەئاشتەوایی نیە.

## ﴿ بزنیك بقاڕیك چوڕیك شیر دەیابوك ﴾

مەبەست لەم پەندە واتا کەسێك خۆی هەڵ بکێشێت بەهات و هاوار بێت بەڵام لەبنەڕەتدا ئەو کەسە ڕابردووی باش نەبێت کەسێکی داوێن پیس یان کەسێکی ئاژاوەگێرو ناحەز بێت، لەلایەکی ترەوە ئەم پەندە بەکەسێکیش ووتراوە کەلە ناخۆشیەك یان کارە ساتێکدا زۆر بەهات و هاوارە بەڵام لەبنەڕەتدا پیاوی لێقەو مان نیە ئەگەر ڕووی شتێکی لێ بنێت.

# ﴿ بەسایی گوڵە گەنمیکەوە گوڵەزیوانیکیش تیر ئاو خوەیك ﴾

مەبەست لەم پەندە زۆرجار لەبەر خاتری کەسێکی باش لە گەڕەکێك یان لە دێیەك شتێك یان یارمەتیەکی پیاوێکی خراپیش دەدرێت، ڕونتر بڵێین لەگوندێك خیرەعام دەکرێت بەشێوەیەکی یەکسانی بۆگشت ماڵەکان دەبرێت بەگوێرەی ئەوەندەی کەبەش دەکرێت لەحسابەکەدا لەبەرامبەردا ماڵێکی هەژار یان کابرایەکی ناکاسب یان کەسێکی پول پیس کەماڵی خۆی ناخوات خێزانەکەی دەڵێت باش بوو بەسای گورەگەنمێکەوە زیوانێکیش تیر ئاوی خوارد.

# ﴿ تا ماڵ بەی بواتیك مزگەفت بەتاڵە ﴾

هەڵبەتە مزگەوت شوێنێکی گشتی یەو لە کۆنەوە تاکو ئێستاش خەڵکی کوردستان بە پێی توانای خۆیان کەل و پەل و کەرەستەی ناو مزگەوتیان بۆدابین کردوە، دەگێرنەوە لەگوندی (کانی لەله) دووسەد ساڵ بەرلە ئێستا کەرەستەی ناو مزگەوتی گوندەکەیان دابین کردوە جاهەرکەسەو پارچەیەك قوماش یان ڕایە خ و جاجم و تەشکە بەڕەیان بۆ بردوە ماڵێکی هەژاریش لە گوندەکە یەك تەشکە بەڕەی دە بێت و دەیە وێت ئەو تەشکە بەڕەیەش بۆ مزگەوت ببات، بەلاّم پیاوێك لەگوندەکە بەناوی ( مام حمە ڕەشی گەورە) کە هاو سێیان دە بێت پێی دەڵێت: کاکە تۆتەنها یەك تەشکە بەڕەت هەیە ئەگەر بیبەی ئەی منداڵەکانت لەسەر چی بخەون؟ ئەویش دەڵێت ئاخر لە خێربێبەش دەبم، مام حمە ڕەش گەورەش پێی دەڵێت کاکە گیان ( تاماڵ پیّ ی بوێت مزگەوت بە تاڵە) واتا نا شێت خۆت بیّ بەش بکەیت لە پێناوی خێردا.

ئەم پەندە واتای ئەو ڕاستیە دەگە یە نێت کەهەر شتێك بە خۆت پێویستیت پێی بوو بۆ خۆت باشترە بەکاری بهێنی نەك بیدەی بەم و بەو .

## ﴿ بیور کلکی لەچویٚ بوك هەرئەوەش بڕیکەوە ﴾

ئەم پەندە واتایەکی گرنگ بەدەستەوە دەدات و بەمانای ئەوە دێت هەرگەل و لایەن و بنە ماڵە و گوندێك ئەگەر خەڵکی نزیکی خۆی لەگەڵ نەیارو دوژمندا دەست تێکەڵ نەکات و نەیەوێت گەل و بنەماڵەو گوندەکەی تێك بشکێت ئەوا هەرگیز تێك ناشکێت و بەرامبەردووژمن نابەزن. بەڵام ئەگەر خەڵکی نەفس نزمی ناو هەربنەماڵەو گەڵ و گوندێك ببێتە نۆکەری بێگانەو خیانەت لەمیللەتەکەی خۆی بکات ئەوا بەئاسانی ئەو گەل و بنەماڵەیە تێك دەشکێن.

## ﴿ چویٚ لەدیزە بوك دیاکە هەس کو ﴾

لێکدانەوەو شیکردنەوەی ئەم پەندە واتای کاتێك کەوچك دەخەیتە ناو دیزەی ڕۆن ئەوەی لەناویدا بێت لەگەڵ دەستتدا دێتە دەرەوە، زۆر جاریش بەرامبەر خەڵك یان بەرو بوموکشتوکاڵی وتراوە واتا دەست بۆشتێك ببەی بەناهومێدی نایگەڕێنیتەوە.

## ﴿ ڕاو ڕێوی ڕاکەوڵە ﴾

مەبەست لە واتای ئەم پەندە ڕاوچی بۆیە ڕاوی ڕێوی دەکات پێویستی بە پێستەکەیەتی تا بیکاتە فەرو ئەگینا زۆر پێویستی بە گۆشتەکەی نا بێت، چونکە لەکوردەواریدا گۆشتی ڕێوی جێبایەخ نیە ئەوەی بایەخی پێدراوە تەنیا بۆکەوڵەکەی بوە ئینجا بۆ جوانی بو بێت یان بۆ دروست کردنی چاکەت و پێدا ویستیەکانی تری ئادەمیزاد بێت.

## ﴿ دار هەڵ بڕ سەگ دز دیارە ﴾

مەبەست لەم پەندە ئەوەیە مرۆڤی خراپ و بەدکارو بەد ڕەوشت ئەگەر کارێکی خراپ بە نهێنیش ئەنجام بدات هەر ئاشکرا دەبێت، ئاشکرا بوونەکەشی زیاتر پەیوەستە بە خۆیەوە و بەهۆی ترس و دڵە ڕاو کێ و گومان کردن لە هەموو کەسێك و ترس لە ئاشکرا بوونی یان بوون و دەرکەوتنی ئاماژەو نیشانێك لە ڕوخساریا کە ئاماژە بێت بەوەی خۆی کەسە تاوانبارەکەیە.

## ﴿ ئەوماڵەی من لەی بیم بێ بەری
## چ عارەب بخوەیکەی چ یەنگی چەری﴾

واتاو شیکردنەوەی ئەم پەندە ئەگەر ماڵێك بەرهەمی ڕەنج و ماندوو بونی کەسێك بێت پاشان بەشێوەی غەدر لەو ماڵە دەر بکرێت یان بێبەش بکرێت، لەبەرامبەردا دەڵێت کەمن لێی بێبەری بوم با خەڵك بیخوات بۆمن وەك یەکە هەرکەسێك بێت، یان بەشێوەیەکی گشتی ئەم پەندە تایبەتە بەو ئافرەتانەی کەژنیان بەسەر دێت دواتر لەلایەن پیاوەکانیانەوە لەماڵ دەر دەکرێن لەو ماڵەی کەلە سەرەتاوە بەماندوو بون بنیاتی ناوە بێ بەش دەکرێت ئەویش ئەم قسەیەدەکات.

# ﴿ كشە كشە پۆپینە ڕەشە مێوان
# شەویك ودوان خوەشە﴾

واتای ئەم پەندە سەبارەت بەمیوان و میوان داریە دەگێرنەوە لە باب و باپیرانمانەوە کابرایەك میوانی دێت لەگوند میوانەکە ماوەیەك دەمینێتەوەلەو ماڵە خزمەی خۆی بەماڵ ومناڵەوە دیارەئەوکات وەك ئێستا نەبوە هۆکارەکانی گواستنەوە ئاسان بێت بەڕۆژێك بتوانیت هەموو خزمو کەس بگەڕێت و سەردانی گشتیان بکەیت، زستان بوە ساڵێکی بەبارات دنیا تەڕو ئاو هەوا سارد بووە ماڵی خانە خوێش جێگاو ڕێگایان کەم بوە ژنی کابرای خانە خوێ بیردەکاتەوە دەڵێت ئەگەر بەشێوەیەك ژنی ئەم میوانەمان حاڵی نەکەم پێی دەچێت وازوو نەڕۆن، ڕۆژێکیان بەیانیەکەی لەکاتی دەرکردنی مریشك و عەلە شیش و پەلەوەرەکانی خۆیان لەو کاتەی کەدانیان پێ دەدات بەلای ژنی میوانەوە چەند جارێك بەدەنگی بەرز دەڵێت کشە کشە پۆپینە ڕەشە میوان شەوێك و دووان خۆشە بۆئەوەی ژنە تێبگات و بە پیاوەکەی بڵێت بابڕۆین ئەم ماڵە چۆڵ کەین .

## ﴿ کشە کشە پۆپینە لارە ئەی زمستانە تاوهارە﴾

مەبەست لەم پەندەش جواب دانەوەی ئەو پەندەیە کەلە سەرەوە باسمان کردوو شیکردنەوەمان بۆکرد کەچۆن ژنی خانەخوێ لەکاتی دان دەداتەمریشکەکانی ژنی میوان حاڵی دەکات کەوا ماڵیان بەجێ بهێڵن و میوان داریەکە درێژەی کێشاوە، دیارە ژنەی میوان زۆر زیرەك و قسە زان دەبێت بەشێوەیەك وەڵام دەداتەوە کە ژنی خانەخوێ توشی شۆك دەکات لەدوای قسەی ژنە ئەمیش دەڵێت، کشەکشە پۆپینە لارە ئەی زستانە تا وهارە واتا دڵ لەدڵ مەدە ئێرە چۆڵ ناکەین تابەهاردێت و دنیا خۆش دەبێت جکەش و هەوا گەرم دەبێت کاتی سەیران و خۆشی دێت.

# ﴿ دووشاو بەگونت لەجیك بێ ئاو ﴾

لێکدانەوەو شیکردنەوەی ئەم پەندە بەکەسێك دەوترێت کە ڕقت لێیەتی یان کەیفت بەچارەیا نایەت یانیش خۆهەڵ کێش و خۆ بەزل زانە زۆربەی جارە کانیش بە کەسانی هەپرە گوون دەوترێت. سەربوردەی ئەو پەندە لەوەوە هاتوە چەند برادەرێك دەچنە دەشت دیارە ئاوو شتیان پێ نامینێت لەپایزێکی وشکەساڵێدا لە توێنوان هیچیان دەست ناکەوێت تەنیا سەیر دەکەن لە ناو تورەگەی یەکیان قتویەك دۆشاوی تیا یە هەریەکەو فڕێکی لێ دەخوات دواتر دەستیان پێوەی دەبێت لێ نابێتەوە چونکە دۆشاو دەبێت بشورێت بەو وەزعەدەمینێنەوە مێش و مێشولەی ئەودەشتە تێیان دەئاڵێن چونکە بۆنی شیرنی دەکەن لەو شوێنە ، دواتر یەك لەوانە دەست بەئاوی دێت دەچێت خۆی خاوێن کاتەوە گەڵ و گونیشی تێدەنێت دیارە زۆر بێزار دەبێت بۆیە پێیان وتوە دۆشاو بەگونت لە جێی بێ ئاو .

## ﴿ خەنێ زۆر بوك دریاك لەگون﴾

خێزانێك لە دێهاتەکانی بنەما لەی دەربەندی زۆر هەژاردەبن و وەکو هەمووخەڵکی ئاوایی خاوەنی مەڕومالآت و مانگا نابن تا بۆبەیانیان ماستیان هەبێت ، بەیانیەك هاو سێیەکیان پڕکاسەیەك ماستیان بۆدەبات و ئەوانیش ئەو بەیانیە تێرو پڕ نان و ماست دەخۆن دواتر کوڕێکی نیمچە یان پاشماوەی ماستەکە دەداتە پشیلە یەکیان ،دواتر باوکی بەتەوسەوە پێی دەڵێت ئەگەر خەنێ زۆر بوو لەگون دەدرێت، دیارە جاران خەنێ پیاوانیش بۆ جوان کردنی ڕیش و سمێڵ بەکاریان دەهێنا، واتاکەیشی ئەوەیە کە هەرشتێك بەبێ ڕەنج وماندوبوون دەستت کەوت و زۆر بوو ئیدی بەخەساری دەدەی.

## ﴿ سەگ سفرە نان بای بەس ئینسان سفرە نان نەدەی ﴾

لەناو کۆمەڵگەدا خەڵکانێك هەن هەرچەندە چاکەو پیاوەتیان لەگەڵ بکرێت و ڕێزیان لێ بگیرێت بەڵام لەبەرامبەردا ئەو جۆرە کەسە وا لێکێ نادەنەوە کە پیاوەتیان لەگەڵ کراوە ڕێزیان لێ گیراوە و هەمیشە ئەو ڕێزو چاکە یەیان لە بەرچاو نیە و بێ باکن لە بەرانبەری ، جالە کوردەواریدا بەو جۆرە کەسە دەگو ترێت سفرە، ئەم پەندەش ئامۆژگاریان دەکات و پێمان دەڵێت( سەگی سپڵە نان بدە بەڵام کەسی سپڵە نان مەدە)

# ﴿ ماڵ لەخوەی نەبی میّوانیشی بی ﴾

واتاو شیکردنەوەی ئەم پەندە کەسێك نوماڵە واتا تازە ژیانی هاوسەری پێکەوەناوە لەبارو گوزەرانێکی ناخۆشدایە لەخانوی کرێدایە یان بەخێر خانوویەکیان داوەتێ وەیانیش لەگەڵ ماڵی باوکیدایە ژورێکیان داوەتێ تەنیا ژیانێکی بژی و نەمرەدەژیەت ئەم ماڵە توانای نان داریان نیە خزمێك بەخاو خێزانەوە بچنە میوانی بۆماڵیان چارەشی نیە میوانیشی بێت دەبێت پارەیەکی زۆر مەسرەف بکات، ئەی دواتر بەچی بیداتەوە کە هیچ داهاتێکی نەبێت بۆ بژێوی ژیانی .

## ﴿ نان خوەر جیگر﴾

لەکوردەواریدا کەسانێك هەن بە هۆی پیری بێت یان بە هۆی نە خۆش کەوتنی درێژ خایەن یان بە هۆی تە مبەڵی و کار نەکردنی بەشداری نەکات لە کارو باری ڕۆژانەی ناو خێزانەکەی بەڵام لە هەمان کاتدا وەکو کەسەکانی تر نان دەخوات و چی هەبێت لە ماڵدا وەکو ئەوانی تر بەکاری دە هێ نێت بەمەش دەگوترێت ( نان خۆری جێگر).

## ﴿ نانیك سوتیاو نیاریك﴾

واتای ئەم پەندە مەبەستی زیاتر ئەو کەسانەیە کە زۆر بێکەڵکن کەسانی نەفس نزمن بەقایان نیە خەڵکی دوڕۆن جارێك کارێکی چاك ناکەن دایم بارن بەسەر خەڵکەوە بۆیەش بەو شێوەیە بەراورد کراون بە نان چونکە نان کاتێك سوتا ناخورێت چونکە تامی ناخۆشە لە هەمان کاتدا توشی سك ئێشەو نارەحتی دەبیت بۆیە بەو شێوەیە بەراوردکراوە.

## ﴿ لەدایك دایە كوڕ تفەنگ چیە لەشەقەی بڕنەو پڕكوندەی گویە ﴾

شیكردنەوەی ئەم پەندە واتای ئەوەیە دایك هەرچەند كوڕەكەی منداڵبێت بەتەمەن و باڵا بەڵام لای ئەو زۆر بەگەورە دیارە و وەك پیاو لێ ی دەڕوانێت و تەماشای دەكات و باسی دەكات نەك وەك منداڵێك، دایك واسەیری كوڕەكەی خۆی دەكات كەوادەتوانێت شارێك بپارێزێت كەچی لەدەنگی شەقەی بڕنەو شەرواڵەكەی پڕدەكات لەگوو، یان سەركدەیەك و سەرۆكی ولاّ تێك لە سەر شاشەی تەلە فزیۆنەكانەوە قسەی گەورە گەورە بكات كەچی توانای بەرگری كردنی نەبێت بەماوەیەكی كەم ولاّتەكەی لەناو بچێت.

# ﴿ ئەوەی کەریکی نەبوك کەریك نیاریك﴾

لێکدانەوەو شیکردنەوەی ئەم پەندە مەست ئەوەیە ئەگەر کەسێك کەرێکی بەرماڵی نەبێت بۆ ئیشوکاری خۆی ئەواکەرێك ناهێنێت، ئەم وتە یە بۆ کاتێك وتراوە کە کەر ڕۆڵی سەرەکی دەبینی لەبوارەکانی ژیاندا بەتایبەت لەبواری ئابوری و کشتوکاڵ بەتایبەتی، ئەو کات ھۆیەکانی گواستنەوە وەك سەیارە بەھەموو جۆرەکانیەوە کە ئێستا ھەیە ئەو کات نەبوو کەر ئەو ڕۆڵەگرنگەی دەبینی ئەگەر چاوێکیش بە مێژووی کوردا بخشێنینەوە لە شۆڕشە یەکلەدوای یەکەکانی کورد دەبینین کەر ڕۆڵی بەرچاوی گێڕاوە بۆبەرەو پێش بردنی ئەو شۆڕشانەو ژیانی کورد لەگواستنەوەی کەلو پەل بەشوێنە عاسی و ناو چیایەکاندا بەڵام بەداخەوە کورد گەیشتە خۆشی و وەفای کەری لە بیر چو ئەو کەرانەی بەرەڵاکرد مناڵان بەبەردوو دار لێیاندەدەن یان لە سەرجادەو شەقامەکان دەسوڕێنەوە وشەی نەشیاویان لە سەرپشت نوسراوە؟؟؟؟؟

## ﴿ کەریك بەکورتانەوە نیاریك﴾

لە ژیانی کۆنی کوردەواریدا و تەنانەت تا ئێستاش گوێدرێژ ئاژەڵێکی سود بەخش بوەو زۆر کارو باری گرانی ڕۆژانەی خەڵکی ڕاپەڕاندوە و لە شۆڕشە یەك لەدوای یەکەکانی گەلی کوردیشدا ڕۆڵیان لەبەرچاوە، جا گوێدرێژی بەکورتانەوە نرخی زیاتر بوو لە گوێدرێژی تر، زۆر جاریش کەسانێك هەبوون تەمبەڵ و ناکاراو کارنەکەر بوە هەمیشە لەسەر ڕەنج و ماندوو بونی خەڵکی تر ژیاوە، ئەم پەندە بەو جۆرە کەسانە دەڵێت( کەرێك بەکورتانەوە ناهێنن).

## ﴿ڕیوی لەکونای خوەی هەڵ گەردیکەوە گەڕدبوك﴾

واتاو شیکردنەوەی ئەم پەندە مەبەستی لەو کەسانە دێت کە سفڵەن و چاکەو پیاوەتیان لەبەر چاو نیە کاتێك کەسێك پیاوەتیەکیان لەگەڵدا دەکات پاش ماوەیەك لە بیریان دەچێت و دەکەونەپیلان گێڕان لەدژی یان دەکەونە زەم کردنی بۆیە لەناو کوردا بەڕێوی ناوبراون چونکە ڕێوی یەکێکە لە گیانەوەرە فێڵ بازەکان .

## ﴿ هیشتا ماین نەسینیاوە وائاخورکەیك﴾

شیکردنەوەی ئەم پەندە لەوەوە سەرچاوە دەگرێت، دەگێرنەوە کابرایەك ڕۆژێکیان لە کاتی ئیشکردنی لەیەکێك لە زەویە کشتوکاڵیەکانی بە کەرو گایەك خەریکی جوت کردن دەبێت لەناو وەردی جوتەکەیدا ناڵە ئەسپێك دەدۆزێتەوەو هەڵی دەگرێتەوە بۆئێوارە کەلەدوای ئیش دەگەڕێتەوە بۆماڵ لەدورەوە هاواردەکات ژنەکەوەرە شتێکی زۆر نایابم دۆزیوەتەوە ژنەکەش دەڵێ ئەیەڕۆ پیاوەکە چیت دۆزیوەتەوە خۆکوپەئاڵتونت نەدۆزیوەتەوە، پیاوەدەڵێت کوپەئاڵتون بەمن چی ئەوە ناڵی ئەسپێکم دۆزیوەتەوە خواگەورەیە بۆسێ ناڵەکەی ترو ئەسپەکەش بابڕۆین ئاخوڕ بۆ ئەسپەکە بکەین کابرادەست دەکات بەئاخوڕکردن بەژنەکەدەڵێت وەرەبم بەستەوە لەو کۆڵەگەیە بزانم ئەسپەکە چۆن جووتە ئەدات ژنە جوان کابرا دەبەستێتەوە کابرادەڵێت بڕۆئالیك بۆ ئەسپەکە بێنە لەوکاتەدا کابرالەجیاتی ئەسپەکە لەقەیەك( جوتەیەك) لەژنەکەی خۆی دەدات و ژنەکە ئازاری پێ دەگات و پێی دەڵێت هێشتاماین نەهاتوە وائاخورکەیك.

# ﴿ کەر بارە کەر مردە ژن بارە ژن مردە ﴾

لێکدانەوەو شیکردنەوەی ئەم پەندە مەبەست لەوەیە کاتێك ماڵێك خاوەنی ئیشوکارو کاری کشتوکاڵی و ئاژەڵ دارین ئەوەی لای ئەوماڵە گرنگە تەنیا کەرێکیان هەبووە بۆپێداویستی ماڵ و نان بردن بۆشوان و ئیشوکارەکانی تری ماڵ بەڵام بۆنەگبەتی کەرەکەیان دەتۆپێت لەدەست و قاچ دەکەون چونکە کەرەکە بۆئەوان لەجیاتی باشترین سەیارەی ئەم سەردەمەبوە بۆیە زۆر لازمە لەلایەن خزمو کەسان و دۆستانەوە کەرێك بۆئەو ماڵە دابین بکەن بۆیە وتراوە کەر بارە کەرمردە، چونکە ئەو قەدری دەزانێت و لێی قەوماوە. دیوی دووەمی پەندەکە دەڵێت ژن بارە ژن مردە لای هەموومان ڕون وئاشکرایە ژن چرای ماڵە وەژن کلیلی ماڵە و هەرژنیشە مایەیی ئاشتی و ئاوەدانی ماڵە بۆیە کاتێك کەسێك لێی دەقەو مێت ژنەکەی دەمرێت ماڵەکەو مناڵەکانی بێکەس دەبن بەواتایەکی تر قوڕ دەکرێت بەسەرپیاوەکەدا بەو کۆمەڵە ماڵ ومناڵانەوە بۆیە لازمە دوای تازیە تەواو بوون لەلایەن خزموکەسەکان و پیاو ماقوڵانەوە هەوڵێك بدەن ژنێك بۆکابرا بدۆزنەوە تالەو بەت بەختیە ڕزگار بکەن بۆیەبەم شێوەویە وتراوە ژن بدە بەژن مردە.

# ﴿ ئەسپیك لەڕ تەویلەیك کەر دیاریك﴾

شیکردنەوەو لێکدانەوەی ئەم پەندە مەبەست لەوەیە ئەسپ واتای دەسەڵاو هێزو شکۆمەندیە هەردەم ئەسپ بەگەورەترو بەنرخ تر سەیرکراوەلەلایەن خانەدانەکان وکاربەدەستانەوە چونکەزۆربەی ئەوجەنگانەی لە مێژوداکراون سوارئەسپەکان ڕۆڵی بەرچاویان هەبوەهەردەم ئەسپ بەواتای دەسەڵات سەیر کراوە، بۆیەش وتراوە ئەسپیك لەڕ تەویلەیك کەردیاریك واتا ئەسپەکە هەرچەندیك لەڕو خراپ بێت هێشتا باشترە لەتەویلەیەکی پڕ لەکەر چونکە ئەسپەکە جێگای ئومێدە بەڵام کەرەکەهەرکەرە نابێت بەئەسپ ئیتر زۆر جاریش ئەم پەندە بەپیاوی چاك و خراپیش وتراوە لەکوردەواریدا.

# ﴿ لەبان نەویایی لە چەمیش بلّندایی ﴾

شیکردنەوەی ئەم پەندە مەبەست لەوەیە کەکاتی خۆی گەنم و جۆیان کردووە لەسەردەمی باب و باپیرانمان کەئەزمۆنیان لەوە وەرگرتوە لەوەرزەکانی شۆپڕین و لەوەرزەکانی چاندندا لە بانەکاندا لەو شوێنانە کشتوکاڵی گەنم و جۆ بچەنن کە شوێنی نزمایی لێیە واتا کۆرتایی چونکە ئەو شوێنانە تەڕی باشتر هەڵدە کێشێت و باشتر ئاو هەڵدەگرێت بۆیە بۆدەغل ودان باشترە بەرهەمی زۆر تر دەدات بەجوتیارەکان، لە چەمیش نزمایی مەبەستی دەشتەکانە کەلەنزیك ئاو ڕوبارەکانە، شێی زۆرە بۆیە بلّندایەکان باشترە بۆکشتوکاڵ کردن چونکە شێی کەمترەو مەترسی لافاویشی کەمترە.ئەم پەندە لەمرۆشدا کاریگەری هەیە بۆمرۆڤەکان بەتایبەت گوند نشین.

## ﴿ دزو خاوەن ماڵ یەك بووك گالە كولانكەی خانیەوە ئاواكەن﴾

مەبەستی ئەم پەندە ناساندنی کەسانی ناپاك و سفلە یە، چونکە هەرکاتێك دزی لە ماڵێك بکرێت دەبێت کەسێکی شارەزا بەو ماڵەو شوێنی ئەو شتە بزانێت کە بەرنامەی دزینیان هەیە بۆیە واوتراوە، ئینجا کەسەکەی کەدەستی لەگەڵ دزی کەرەکەیە کەسێك لە ئەندامانی خاوەن ماڵ بێت یان شوانێکیان یان ڕێنجبەر یان هەرکەسێك لەو ماڵە کەشارەزایی تەوای لەو ماڵەدا هەبێت دەست تێکەڵ کات لەگەڵ دزەکەدا دەتوانێت بەنرخ ترین شتی ئەو ماڵە بدزێت بۆیەش بەم شێوەجوانە پێشینان وتویانە .

## ﴿ خەمم ئەوەنیە مردی لە ماڵم مریك ، خەمم ئەوەست عیزرایل بەماڵم فێر دبووك﴾

لێکدانەوەو شیکردنەوەی ئەم پەندە مەبەست ئەوەیە کاتێك کەسێك دەچێتە ماڵێك بۆشتێك یان پێداویستیەك لەکەل و پەلی کشتوکاڵی یان کەل و پەلی ناوماڵ، ئەوکەسە بەردەوامیش دەچێتەوە ئەوماڵە بۆ ئەوشتانە وای لێد یت ئەو ماڵە بێزاردەبن لەدەست ئەو جیرانەیان، چونکی ئەوەندە لەناوەخت بۆشت چۆتەماڵیان ئەو ماڵەش ئەوکەسەیان خۆش ناوێت تاهەموو ڕۆژێك بەرێزەوە شتەکەی بدەنێ دیارەکەسەکە ناپاك بووە لەڕاستیدا حەزیان لێنەبوە بیبینن نەك شتی بدەنێ ، بۆیە بەم پەندە جوانە بەکابرادەڵێن حەزناکەین چیتر بۆشت بێیتە ماڵ مان.

## ﴿ نانیك بخۆو نانیك بكەرە خێر من دەستت كەفتیوم﴾

شیكردنەوەی ئەم وتە بەنرخە مەبەست لەوەیە كەكوڕ كاتێك ژن دێنێت حەزدەكات كچێكی باش و خانەدانی دەست بكەوێت لەبنەماڵەیەكی باش بێت، لەھەمانكاتدا كچیش حەزدەكات كوڕێكی دەوڵەمەندو باشی دەست بكەوێت، لەدوای گواستنەوەو زەماوەند كردن ئەگەر ھەست بكرێت لایەكیان لەچاو لایەنەكەی ترەوە شكست تر دیارە ئەوالە بەرامبەردا ئەولایەی خۆی بەخانەدان و گەورەتردادەنێت ئینجا كچە بێت یان كوڕە لەبەرامبەردا بەوی تر دەڵێت نانێك بخۆو نانێك بكە خێر كەمنت دەست كەوتوە كێ بەتو ڕازی دەبوو خواخێری من بنو سێت.

## ﴿ئەوە تیز بەمن کەی دوێتە تیزاو تیزت بوك تیز بەوە بکە کوێنە حیزت بوك﴾

لێکدانەوەو شیکردنەوەی ئەم پەندە لەبەسەرهاتێکەوە دروست بوە دیارە کاتی خۆی دەژن یان دووکچ بەشەر دێن دەبێتە دەمە قاڵێ یان بەشەڕەقسە لەئەنجامدا کام وشەی ناشرین بێت بەیەکی دەڵێن کامە قسەی نەشیاو نا بەجێ یە ئاراستەی یەکتری دەکەن بۆیە یەك لەژنەکان دیارە ڕابردوی ئەوەی تر باش دەزانێت کەچ جۆرە ئافرەتێك بوە ئینجا چ داوین پیس بو بێت یان چەنەباز بوبێ بەم پەندە وەڵامی دەداتەوەکەبەچەند وشەیەکی کەم، دوێتە را تیز بەم کەی تیزبەوە بکە کوێنە حیزت بووك.

# ﴿گورگ پیر بووك دبووکە تیزە جارِ سەگ﴾

واتاو لێکدانەوەی ئەم وتەیە زۆر مانا هەڵ دەگرێت، واتا گورگ کەگیانداریکی درِندەو بەهێزوو بەتوانایە،یەکێکەلە گیاندارە کاول کەرەکان کاتێك بگاتە رِانە مەڕێك تاتوانای هەبێت هەموویان لەناودەبات،بۆیە هەندێك لە ئاژەلە کێو یەکان ناتوانن بەرەنگاری ببنەوە لەوانە سەگ، بەلاّم ئەم ئاژەڵە کاتێك بەناو ساڵەوە چوو پەکی کەوت پیر بوو، دەبێتە قەشمەڕجاری سەگ، بە ئارە زووی خۆیان سەگەکان یاری پێدەکەن، ئەم نمونەیە لەلای مرۆڤەکانیش هەمان شتە کابرایەکی چەتون و جام بازوو شەڕانگێز کاتێك کەبەناوساڵەوە وو پیر بوو ئەو توانایەی نەما لەمناڵ و لەگەورە بە ئارەزوی خۆیان گاڵتەی پێدەکەن، بۆیە ئەم گەوهەرەی پێشینان زۆر گرنگە مرۆڤ کەڵکی لێوەرگرێت بۆئەوەی هەڵە نەکات لەژیان.

# ﴿ بەدیوارقورِ وەتن عومرت چەندە وەت بەکێ بویشن﴾

لەکۆن دا تایەم سالآنەی دوایەش خەڵکی لادێکان خانویان لەقورِدروست دەکرد، ئەو قورِەی بۆدروست کردنی خشت و رِێزکردنی دیوارەکان بەکاریان دەهێنا بۆخۆرِاگرتن و هەڵنەوەرینی (کا)یان تێ دەکرد، جا(کا)ی باش و (کا)ی خراپ هەبوو وەباشی خشت و دیوارەکەش بەند بوو بە جۆری قورِەکەو جۆری (کا)یەکە، مەبەستی ئەم پەندە تەنها دیوارو خشت و (کا) یەکەنیە بەڵکو مەبەستی ئەوەیە لە کاتی کارو باری بەکۆمەڵی (هەرەوەزی) خەڵکدا کەسێك هەیە کەرِاپەرِێنەری کارو بارەکان بێت لەم پەندە( کا) یەکە بەو کەسە شوبهێنراوە، واتا ئەگەر کەسەکە کەسێکی باش بێت کارو بارەکەش بەباشی بەرِێوەدەچێت.

# ﴿ شەڕ لەشوێم نەوەك لەتوێم﴾

جاران جوتیار شۆی زەویەکەی دەبڕی و ئامادەی دەکرد بۆ داچاندن، داچاندنیش لەولاتی ئێمە بەتایبەتی گەنم و جۆ لەناوەڕاستی مانگی یەکەمی پایزدا دەستی پێ دەکرد، جوتیاری باش ئەو کەسە بوو لەکاتی شۆدانی زەوی دا چۆنی بوێ ئاو ها بیکێڵێت، چونکە لەکاتی تۆو داندا نەدەتوانرا جگە لەتۆو دان هیچی تر گۆڕانکاری لە شێوەی کێڵان و بڕینەوەی لاتەکانی زەوی بکرێت، ئەم پەندەش بەوە ئامۆژگاریمان دەکات کەبەرلەوەی هەرکارێك بێتە نزیك کۆتایی ناتوانرێت کارەکانی سەرەتایی باش بکرێت هەربۆیە دەڵێ لەسەرەتای هەرکارێك تەگبیرو ڕای تەواوی لەسەربکە ئینجا دەست بکە بە جێ بەجێ کردنی کارەکە واتە تەگبیر لەسەرەتای شۆنەك لەتۆو.

# ﴿ جوێ بەپڕی گەنم بەتەنکی پەسندە ﴾

مەبەست لەم پەندە ئەوەیە لەوەرزی تۆکردندا کاتێك جوتیار گەنم تۆدەکات دە بێت ڕەچاوی ئەوەبکات گەنم تاتەنك بێت باشترە، چونکە گەنم پنج دەکات و گوڵەکانی قەڵەوتر دەبێت و بەرهەمی باشتر دەدات بەدەستەوە ، بەڵام لەکاتی چاندن و تۆکردنی جۆدا دەبێت زۆر بەپڕی بیچەنێت چونکە جۆ بەپڕی پەسندەو بەرهەمی باشتری دەبێت بۆوەرزێرەکە دانەوێڵەی جۆ تاپڕبێت و لەکاتی گەشە کردنیدا بەباران وەشت بەسەریەکدا بکەوێت باشترەو بەرهەمەی زیاترە، بۆیە دەکرێت جوتیارانمان سود لەم پەندە وەربگرن لەکاتی چاندنی گەنم وجۆدا ، چونکە ئەم وتەیە دوای ماندو بونێکی زۆر وە تاقیکردنەوەیەکی زۆرلەلایەن جوتیارەکان و پیاوە بەتەمەنەکان و دنیا دیتەکانەوە هاتۆتە بەرهەم .

# ﴿هەشت بوك لەمشت بوك نەوەك نۆبوك و نەبوك﴾

ئەم پەندە لە شێوەزاری کرمانجی خوارو دا بەم شێوەیەیە( هەشت بێ لەمشت بێ، نەك نۆبێ و نەبێ) واتە ئەگەر داهات ودەستکەوتێك هەرچەندە زۆریش بێت مادام کاتەکەی نادیارە دەچێتەخانەی نەبونەوەو ڕەنگە ئەو داهات و دەسکەوتە بەدەست نەیەت، پەندەکە پێمان دەڵێت ئەگەر داهات و دەسکەوتەکە کەمتریش بێت بۆکاتی ئێستا پێ ی ڕازی بە نەوەکو زۆر تربێت و نەگەری نەبوونی زیاتر بێت.

# ﴿ مامر هێلکەی قاز بکەیك قوینی دڕیك ﴾

هەموو مرۆڤێك پێویستەلە ئاست تواناو هێزی خۆی کاربکات نەك بە قەد کەسێکی تر کە تواناو هێزی لەوزیاترە، ئەم پەندە هەموو بوارەکانی ژیان دەگرێتەوە و ئامۆژگاری مرۆڤ دەکات بەوەی لە هەلسو کەوت و مامەڵەو ئاڵوگۆڕو خانوو دروست کردن و ژیان و گوزەران و کرێکاری و جوتیاری و بوارەکانی تری ژیان دەبێت بە پێی هێزو توانای خۆمان بجولێینەوە و مامەڵە و ڕەفتاربکەین و سنوری تواناو هێزی خۆمان بناسین و بزانین، چونکە هەرکەسێك لەسنوری تواناو هێزی خۆی تێپەڕی توشی نوچ دان و ژین دەبێت.

## ﴿ دوومایین بکەیە دوریك خوی یەك گرن
## بەس ڕەنگ یەك نێگرن﴾

زۆرجار لەکۆمەڵگەدا بینیومانە دووکەس کە هاوڕێیەتی یەکتری دەکەن هەموو ڕەفتارو خاسیەت و جوڵانەوەیەکی یەکتر لەیەکتروەردەگرن جا ئەو خاسیەتانە باش بن یان خراپ، لە هەمان کاتدا ناتوانن و سیماو ڕوخساری ڕاستەقینەی شێوەی دەموچاویان لەیەکتر وەربگرن و ئاڵوگۆڕبکەن، واتە مرۆڤەکان لەژێر کاریگەری یەکتر هەموو خاسیەتە باش و خراپەکان لەیەکترەوە فێر دەبن و گوزارشتیشی لێ دەکەن، ئامانجی ئەم پەندەش ئەوەیە پێویستە مرۆڤ لە گوڕینەوەی هەست و ڕەفتارو خاسیەتەکان بە ئاگا بێت و خۆی بەدووربگرێت لەوەرگرتنی خاسیەتەخراپەکان.

## ﴿ گوشت گون خوەت بخوەی لەمنەت قەساب باشترە ﴾

کەسانێك هەن لەناو کۆمەڵگەدا ئەگەر چاکەیەك لەگەڵ کەسێك بکەن هەمیشە دەیڵێنەوە و منەتی بەسەردا دەکەن و دەیانەوێت تاهەتایە ئەوکەسە منەتباربکەن بەوچاکەیە، هەربۆیەش ئەم پەندە پێمان دەڵێت هەرکاتێك بێ پارە بویت و حەزت لە گۆشت بوو باشتروایە گۆشتی گونی خۆت بخۆی لەمنەتی قەساب باشترە کەهەمیشە چاکەکەت بەچاودا دەداتەوە، واتە توخنی کەسانێك مەکەوە کەچاکەبۆ گوتنەوەو منەت کردن ئەنجام دەدەن خۆنەگەر زۆریش پێویستت بەو کەسانەبوو واباشترە چاکەکەی لێ وەرنەگریت.

# ﴿ بار بەبان گاوە کوڕ فێرە خوەندن بکەی ﴾

شیکردنەوەو لێکدانەوەی ئەم وتەبەنرخە مەبەست ئەوەیە کاتێك منالْ دەتوانێت بخوێنێت ئەواباوك کەشێکی فەراهەمی بۆبڕەخسێنێت بتوانێت پێداویستیەکانی خوێندکارەکە بێنێتە دی ، ناکرێت مالْ لەسەر پشتی گا بێت و هەررۆژەی لەهەوارێك بێت بەتەمای ئەوەش بیت کوڕەکەت فێری خوێندن بێت و شەهادەت بۆ بێنێتەوە، ئەم پەندە لە کاتێکدا وتراوە لەسەردەمانی زوو ئەوکاتانەی خەڵکی لادێکانی کوردستان خەریکی کشتوکالْ و ئاژەلْ داری بوون هەر ڕۆژەی لە هەوارێك بوون لەناوەیەکەوە بۆناو چەیەکی تر لەوکاتانەدا کابرایەك هەبووە ماڵەکەی لەسەر پشتی گابووە بۆهەوارو مەڕ لەوەڕاندن لە هەمانکاتدا ئەیویست کوڕەکەشی فێری خوێندن بکات لای مەلای گوندەکەیان ئەو کات زەمانی حوجرەو فەقێیەتی بوو لەگوندەکان فێرگەی ئاینی هەبوو بۆیە بەتەوسەوە بەکابرایان وتوە چۆن کوڕ وا فێردەکرێت. تۆ هەر ڕۆژەی لەهەوارێکی.

# ﴿ گا بەگون ناسیك ﴾

واتاو لێکدانەوەی٬ئەم پەندە مەبەست لە کابرایەکی گێل و گەوج ونەفامە کە تەنیا ئەگەر گونی گایەکە ببینێت ئینجا دەزانێت ئەوەگایە، ئەم پەندە پێمان دەڵێت پێویستە کەسەکان لەناخەوە بناسین نەك بەرووخسارو شێوە. ئەم پەندە دەلالەتە لە بێعەقڵی و دەبەنگی کەسەکان بەڵام لەزۆربەی پەندەکاندا ناوی ئاژەڵەکان بەکار هاتوە شوبهێنراوەبەکەسەکان بۆئەوەی زویر نەبن تابەتەواوەتی لەماناکەی ئەگەن ئەم وشە کوردیە جوانانە مایەی شانازین بۆئێمە دەبێت پەندو ئامۆژگاریان لێوەرگرین بۆئەوەی لەئیشوکاری ڕۆژانەماندا پشتیان پێببەستین بۆڕایی کردنی کارەکانمان، وەبۆئەوەی مرۆڤێکی کارامەو زیرەکمان لێدەر چێت.

# ﴿کەر ببەیە بەغدا نیّ بوکە هەستر﴾

شیکردنەوەو واتای ئەم پەندە مەبەست لەو جۆرە کەسانەیە کە نەفامن یان هەبڵە گوونن وەیان گێلن ئەو جۆرە کەسانە هیچ گۆڕانکاریەك بەسەر ژیانیاندا نەهاتوە بەدرێژایی ڕۆژگار واتالەگەڵ بەرەو پێش چونی سەردەمدا ناگۆڕێن بۆیە بە ئاژەڵێکی وەك کەر شوپهێنراون چونکە کەر هەرکەرە لەکوردستان بێت یالە بەغدا ئەوکەسەش هەر ئەو بەشەرە گەوجەیە لەکوردستان بێت یان بیبەیتە بەغدا ناگۆڕێت لەسەر گەوجیەکەی خۆی بەردەوامە هەرلەسەرکەلە ڕەقیەکەی خۆیەتی بۆیە پێشینان بەم وتە جوانە ئەو کەسانە وەسف دەکەن.

## ﴿ ژن بەسەروو پۆڕەوە کەر بەجل و جۆڕەوە ﴾

واتاو لێکدانەوەی ئەم پەندە ژن هەرچەندێك بەرگی جوان بێت جوانتر دەردەکەوێت واتا ئافرەت بەجلی ڕەنگاوڕەنگو پۆشتەوە جوانترە لەوەی خۆی ڕووت کاتەوە و بەجلی تەنکەوە خۆی بخاتەروو بۆپیاوان ، بۆیەش لەگەڵ کەر بەراورد کراوە چونکە لە سەردەمانی باوباپیرانماندا وەك ئێستا هۆیەکانی گواستنەوە نەبوو جۆرەها سەیارە بێتە هەرێمەوە کاو مۆدێلی بەرزە داخلی کوردستان بێت تەنیا بەس کەر بوو پێدا ویستی ژیانی ڕۆژانەی خەڵکی دابین دەکرد، خاوەنی کەرەکە ئەوەندە کورتان و قڕاسەی کەرەکەی خۆی جوان دەڕازاندەوە بەگوڵێنگەو پەڕۆی ڕەنگاو ڕەنگ ، بۆیە بەراورد کردنی ئەو دووشتە بەیەك سوکایەتی نیە بەئافرەت بەڵکو ئەوەدەگەیەنێت کە ئافرەتیش بەو جلە کوردیە جوانەوە شەو قو ڕەونەقێکی تری هەیە لەبەرچاوان جوانتر دەردەکەوێت.

## ﴿ بێوە ژن و دوێت فەرقی یەك شەوە بەڵام هەر یەك شەو بەهەزار شەوە ﴾

واتاو شیکردنەوەی ئەم وتە بەنرخە مەستی لەوەیە کاتێك کچێك شودەکات دەچێتە ماڵو مێردی خۆی بەڵام دوای ماوەیەك بە قودرەتی خوا پیاوەکەی بەکارەساتێك یان بەمەرگی خوا کۆچی دوایی دەکات ، دوای تەواوبونی پرسە بە تێپەربونی کات ماڵی باوکی کچەکە داوادەکەن ئەگەر بەپێی شەرعی ئیسلام کەسێکتان ئەوکچەتان لازمە بۆیەك لەبراکانی پیاوەکەی ئەوادەتانی دەینەوە باحەلاڵی بێت ئەگەرلازمتان نیە جائیز نیە ئافرەتێکی نامەحرەم لەو ماڵەدابێت بەبێوەژنی، دیارە لەدوای پرس و ڕاوێژ لە نێوان ماڵی غەزورانی ژنەی قورِ بەسەر بۆئەوەی بزانن کامیان لەبراکان بیخوازنەوە چونکە بەشێك لەبراکانی ژنیان هێناوە ناکرێت بیکەنە دوو ژنە توشی کێشە دەبن لەگەڵ خێزان و منداڵەکانیاندا بۆیە دواجار ڕوودەکەنە برابچوکەکەی کەماوە دەڵێن ئێمەلەبەر هەندێك کێشەو جیاوازی تەمەن ناتوانین بیخوازینەوە بەڕای ئێمە بۆتو باشە چونکە

برای بچوکیت و لەلای باوکمانی ئەمەش خێزانی ڕەحمەتیە خوداش ئەمەی پێخۆشە، کوڕە بچوکەکەش نازانێت بڵێ چی لەو مەوقیفەدا بۆیە بەناچاریەوە دەڵێت ئاخر ئەمە بێوە ژنە براکانیش لەولامدا دەڵێن ئینجا چیە براله خۆفەرقی تەنیا یەك شەوە برابچوکەکەش زۆر عاقڵ دەبێت لەولامی براکانیدا دەڵێت ڕاستەفەرقی یەك شەوە بەڵام هەریەك شەوەو خێری بەهەزار شەوە!!!!!!.

## ﴿ ئەوەی بەبێوەژنی کەیەیی بەدوێتی بکردایتەی ﴾

شیکردنەوەو لێکدانەوەی ئەم پەندە مەبەست ئەوەیە کچێك لەکاتی لاویەتیداو لەهەرەتی جوانیدا کوڕێك زۆر بەتەمای دەبێت شوی پێبکات بەڵام کچە زۆر لوت بەرزدەبێت و کەکوڕە کە دێتەداوای بۆئەوەی شوی پێبکات کچەکوڕەکەی بەدڵ نەبوەو شوی پێنەکردوە بەڵام دوای ماوەیەك کچە کە داخوازی دێت و شودەکات بەکەسێکی تر بەڵام کاری خوا وادەبێت تەمەنیان زۆر بەیەکەوەنابێت پیاوەکەی دەمرێت کچە بێوەژن دەکەوێت دێتەوە ماڵی باوکی بەڵام هێشتا ئەو کوڕەی کەیەکەم جار بەتەمای بوو ژنی نەهێناوە بێوە ژنە ئەم جاردەوری کوڕە دەسوڕێت کەوا بێتەداوی شوی پێبکات بەڵام کوڕە زۆر عاقڵ دەبێت بەبێوەژنەدەڵێت ئەوەی بە بێوەژنی دەیکەی بەکچێنی بت کردابوایە، ئەمەلایەك لەلایەکی تریشەوە بەمانای ئەوەش دێت کەسێك کاریکی دێتە پێش نایکات یان بەدڵی نیە، ئینجا هەرکارێك بێت لەکارەکانی ڕۆژانەی ژیان، بەڵام دوای تێپەڕبوونی کات پەشیمان دەبێتەوە بۆئەوکارەی نەکردوە تەمەنا دەکات دووبارە ئەو کاتەی بۆ بگەڕێتەوە .

## ﴿ میوان چاك خانەخوێ خەراپ﴾

ئەم پەندە لەئەنجامی کەڵەکە بوونی ئەزموونی زۆرو زەوەند گوتراوە و ماناکەیشی ڕوونو ئاشکرایە و واتای ئەوە دەگەیەنێت لە میوانداری خەڵکدا ئەگەر باش خزمەت کرای تۆش وابە ، ئەگەر کەسێك لە کارێکدا هاوکاری کردی تۆش بۆ کەسانی تروابە.

## ﴿ ئاو لەکێنیك خواردیتەوە بەرد فڕە مەدەرەناوی﴾

لێکدانەوەو شیکردنەوەی واتای ئەم پەندە مەبەستی ئەوەیە کاتێك کەسێك پیاوەتیەکی لە گەڵتدا کرد قەت لای خەڵکی زەمی مەکە، یان ئەگەر لە ماڵێك نانت خوارد لەدوای نان خواردن کەلەماڵیان هاتیتە دەرەوە لای خەڵك باسی مەکە مەڵێ ئەو شتەیان داوە پێم یان بەخراپە ناوی ئافرەتەکانیان یان کەسانی ئەو خێزانە بێنیت، بەشێوەیەکی گشتی کەسێکی وەفاداربیت نەك کەسێکی سپڵە ئەم پەندەلەگەڵ ئەوپەندە یەك دەگرێتەوە کەدەڵێت نان بدەبەسەگ مەیدە بەسپڵە، ئەم پەندەجوانە مرۆڤەکان بەراورد کراوە بەکانی و ئاو چونکە ژیان بێ ئاو نابێت .

# ﴿ لەخەرمان دوڕاندیتەی بەتەمای لەکلکە بیاریەوەی ﴾

شیکردنەولێکدانەوەی ئەم پەندە مەبەست ئەوەیە کاتێك کەسێك لەوەرزی دروینەو خەرمان کوتاندا خەریکی شەنەبەبای خەرمانی گەنمەکەیەتی بەلاّم بەشێکی زۆری گەنمەکەی لەگەڵ کایەکەدا لەگەڵ بادا ڕۆیشتوە لەبەرنەزانی خۆی و بەقوەتی بایەکە لەئاخرو ئۆخری کلکەی گەنمەکەی کەجیا بۆتەوە خەریکە لەکلکەی بیهێنێتەوە هەرخەریکی خڕکردنەوەو کلکەو دولکەیە لەوکاتەدا باوکی یان خاوەنی کارەکە دەڵێت لەخەرمان دوڕادیتەی بەتەمای لەکلکە بیاریەوەی، لەلایەکی تریشەوە ئەومەبەستە دەگەیەنێت کەکچێك لەتەمەنی لاویەتیدا کەسایەتی و جوانیەکەی دۆڕاندبێت وبەبایدا بێت بەلاّم لەتەمەنێك کەکەس نایەتەداوای قەیرە بووە خۆی وادەربخات کەکەسێکی شایستەیە ئەم قسەی پێ دەوترێت کەلە خەرمانی جوانی خۆت دۆڕاندوتە بەنیازی لە کلکەبیاریەوەی.

# ﴿ بەین دۆستایەتی و دوژمنایەتی چیا بووك دبوكەداوە مویك﴾

لەم پەندە ئەو ڕاستیەمان بۆ ئاشكرا دەبێت كە بوونی ڕێزو خۆشەویستی و هاوڕێیەتی ڕاستەقینە لە نێوان دووكەس یان زیاتر ئەگەر كێوێكیش لە نێوانیان بێت واتەزۆر دوربن لەیەكتر بەڵام ئەو دووریە هیچ كارناكاتە سەرمانەوەی ئەو ڕێزو خۆشەویستی و هاو ڕێیە تیە، بەواتایەكی تر هاو ڕێیەتی ڕاستەقینە و بێ تەماح باكی بە دووری و دووركەوتنەوە لەیەكتر نیە، بەڵام ئەگەر دووژمنایەتی و ناكۆكی و شەڕو ئاشوب نێوان دووكەس هەرچەندە ماوەی نێوانیان نزیك بێت بەقەد تاڵە مویەك بەڵام ئەونزیكی ڕێگایە هیچ ڕۆڵێكی باش نابینێت لە نێوانیان دا.

# ﴿ خورکت گەنمی بوك بانانەکەت جوێ بوك﴾

مینۆرسکی مێژوونوسی ڕووسی لە کتێبی (کورد) باسی ژیانی کۆمەڵایەتی گەلی کورد دەکات و پێیی وایە کورد بەشێوەیەکی گشتی میوان دۆستن و ڕێز لەمیوان دەگرن و هەموو خزمەتێکی پێشکەش دەکەن، ئەم پەندەش دڵنیاکردنەوەی بۆچونەکەی مینۆرسکیە و پەندەکە پێمان دەڵێت ئەگەر نانەکەت لە(جۆ) ش دروست کرابوو بەڵام لە میوانداری و خزمەت کردنی میواندا خۆت وەك گەنم جوانبەو پێشوازی گەرم لە میوانت بکەو پێیان دڵخۆش بەو ڕێزیان لێ بنێ و قسەت لە گەڵیان خۆش بێت.

# ﴿دۆم کەڵاش ڕاکوڕ خوەی بکەیك
# دبووك چوین بووك﴾

ئەم پەندە مەبەست لەوەیە کاتی خۆی دۆم و قەرەجەکان لەهۆنینەوەو دروست کردنی کڵاشدا دەستی وەستایی باشیان هەبوو، کەبۆخەڵکیان دروست دەکردوە ئینجا ئەگەر بۆکوڕی خۆیان دروستیان بکردایە دەبوایە چەند جوان دروستیان بکردایە ، بەواتایەکی تر هەرکارێك کەسێك بیکات بۆخەڵکی تر کەوەستا بێت لەو بوارەدا دەبێت بۆکوڕەکەی خۆی کەچەند خۆشەویستە لەلای دەبێت چەند جوانترو باشتر دروستی بکات، ئەمەش لەسەر ئەوەیە دایم مرۆڤ کوڕی خۆی لە خەڵکی تر خۆش تر دەوێت و بەواتایەکی تر ئەو وەستایەی بۆئیشی خەڵك وەستایەکی کارامەیە ئەوا بۆئیشی خۆی دەبێت چۆن بێت.

# ﴿ قەرت کوێن دبوك بەس نیٚ فەو تیك﴾

لێکدانەوەی ئەم پەندە مەبەست ئەوەیە ئەگەرشتێك لەکە سێك وەربگریت یان هەرشتێك بەقەرز بدەیتە کەسێك ئەگەر زووش بۆتی نەگێڕێتەوە خەمت نەبێت نافەو تێت، لەلایەکی ترەوە ئەم پەندە ئەو مەبەستەش دەگەیەنێت ئەگەرهەقت کەوتەلای کەسێك نەیدایتەوە یان غەدرێکی لێکردیت یان بەناهەق ماڵتی خواردبوو، ئەو هەقە کۆنیش بێت نافەو تێت ڕۆژێك دادێت دەسەلآتت دەبێت و دەتوانیت ئەو حەقەی خۆت وەرگریتەوە بۆیە پێشینان لەدوای چەندان تاقی کردنەوەو بەسەرهاتی دورو درێژ چەندان ڕوداویان بەسەرداهاتوە ئینجا ئەم ووتەجوانانەیان بۆ ئێمە بەجێهێتوە.

# ﴿ ئەگەر بزنیك باش بیایت لە هەویز خوەت قشپل دکردیت﴾

قشپل پاشماوەی ئاژەڵی وەك مەڕو بزنە و لەکۆنەوە تا ئێستاش وەك پەین بۆ کاری کشتوکاڵی بەکار دێت، هەربۆیە خاوەن ئاژەڵەکان هەمیشە ماڵا تەکانیان لە شوێنێك ڕادەگرن تا قشپلەکەی بەخەسارنە چێت و دواتر بتوانن کۆی بکەنەوە و بۆکشتوکاڵ بەکاری بهێنن، واش ڕێکەوتوە کە بزنێکی لاسارلە هەوێزی خاوەنەکەی بخواو بخەوێت و بەڵام قشپلەکەیشی لە هەوێزی خەڵك یان لەشوێنێك بکات بەکەڵك نەیەت، ئەم پەندە لەوەوە هاتوە ئامۆژگاریمان دەکات بەوەی وڵات و نیشتمان و گوندو شاری خۆمان خۆش بوێت و ئەگەر کارێکی باشمان لەدەست هات بۆوڵات و شارو گوندەکەی خۆمانی ئەنجام بدەین نەك شوێنی تر، خۆئەگەر کارەکە بۆ وڵات و شارو گونی خۆمان ئەنجام نەدەین ئەم پەندەمان بەسەردا دەچەسپێ.

# ﴿ برایك مریك، برایك دەوڵەمەند دبووك﴾

لێکدانەوەو شیکردنەوەی ئەم پەندە مەبەستی ئەوەیە کاتێك برایەك دەمرێت بەهەر هۆکارێك بێت، ئەوالەدوای خۆی هەرچی سەروەت و سامانی کەهەیبوە لەژیاندا بەچەرمەسەری پێکەوەی ناوە بۆخۆیو ماڵ ومناڵەکانی ئەدرێت بەو برایەی کەوالەژیانداماوە پەێی ئاینی پیرۆزی ئیسلام کەئەم کارەی حەلاڵ کردوە لەدوای نەمانی برایەك براکانی تری دەبنە وارسی، جاری واش هەیە ئەو برایەی کەماوە ئەوەندە زاڵمە ڕاستەو خۆ لەدوای وەفاتی براکەی هەڵدەستێ بەمارەکردنەوەی براژنەکەی خۆی لەلای خەڵکی واخۆی دەردەخات کەئەمەخەم خۆری مناڵەکانی براکەیەتی و بۆئەوەی مناڵەکان غەریب نەکەون، بەڵام لەناخەوە مەبەستێکی تری هەیە ئەویش ئەوەیە لەجێگەی براکەی دەست بگرێت بەسەر سەروەت و سامانی براکەیداو بەو هۆیەوە بگاتە ئەو دەسەڵاتەی کەبراکەی هەیبوە پاشانیش کەخۆی مناڵی لەژنی براکەی پەیدابوو ئەوا هەرزوومناڵەکانی برامردوەکەی فەرامۆش دەکات و ئیهتمامیان پێنادات و خۆی لێیان

تورەدەکات زۆر جاریش هەبوە ئەو منا لانە دەردەکات یان بەدایکیان دەڵێت بەخۆت و منالّەکانتەوە لەم مالّە بچنەدەرەوە............هتد

## ﴿ پیاو کەدەولّەمەند بووك یان ژن هەلّ گریك یان زەلام کوشیك ﴾

لەخۆبایی بوون و لەخۆ دەرچوون ئەو خاسیە تانەن کەلە مرۆڤدا هەن بە تایبەتی لە کاتی دەولّەمەند بوون و دەست ڕۆیشتندا، ئەم پەندە پێمان دەڵێت کەسانێك هەن بە هەژاری و نەداری یاخود لەکاتی دەست نەڕۆیشتنیان کەسێکی باش و گونجاون لە هەموو ڕوویەکەوە بەلاّم کاتێك کە دەولّەمەند دەبن یان بەرپرسیارێتیەك بەدەست دەهێنن ئیدی لە خۆیان دەردەچن و ڕۆژانی هەژاری و بێدەسەلاّتیان لەبیر دەکەن لەو کاتەدا یان ژن هەلّدەگرێت یان کەسێك دەکوژێت.

# ﴿ئاسیاو لە میز میزە بووك هەر میزیك﴾

لێکدانەوەو یکردنەوەی ئەم پەندە بەنرخە، مەبەست لەوەیە کە تۆکەسێك ئامۆژگاری دەکەیت و ئاگاداری دەکەیتەوە لەهەموو کردەوەنابەجێکانی و ڕەوشتە نەشیاوەکانی بۆئەوەی بیکەیتە کەسێکی شیاو لە کۆمەڵگادا کەسێکی باش بێت، بەڵام ئەو کەسە چونکە کەسێکی خراپ و بەدڕەوشتەو خاوەن کەسایەتیەکی لاوازە گوێ بەقسەکانی تۆهەرنادات هەردەجولێتەوە هەڵەیەك دەکات هەرچەندی ئامۆژگاریشی کەی هەوەك خۆیەتی. لەلایەکی ترەوە ئەم پەندە بەو ژن و پیاوانەش دەوترێت کەلەگەڵ یەك ناگون جێن و دایم قونە شەڕیانە خەڵك لەنێوانیانە هەرجارەی ژنەکە بتۆرێت بەمانگێك نایەتەوە کەدێتەوەش لەگەڵ پیاوەکە ناگونجێت بۆیە وتراوە ئاسیاو لە میز میزە بێت هەرمیزیك واتا هەر تەڵاق دەترێت نەمرۆش نەبێت سبەینێ.

## ﴿سەگ بترسنیەی نەکوشییەی﴾

شیکردنەوەو لێکدانەوەی ئەم پەندە بەنرخە دوو واتای هەیە یەکەمیان مەبەستی لەوەیە ئەگەر سەگێك زۆر لێی ترسایو خەریك بوو بت خوات هەوڵ بدە بەجۆرێك بیتر سێنیت کەتاماوە ئەو سەگە چاوی بەتۆکەوت نەوێرێت نوزەشی لێوە بێت، دووەم لێکدانەوی لەم پەندەدا منداڵی شبهاندوە بەسەگ وای لێکداوەتەوە کەمنداڵ بونەوەرێکی پاکەو چۆن پەروەردەی کەی وادەردەچێت وەك هەویر وایە چۆن بیشێلیت وادەردەچێت واتا لەپەروەردەکردنی منداڵدا لەکاتی هەرهەڵەیەکدا کەئەنجامی دەدات نابێت لێی بدەیت بەشێوەیەك کەئازاری پێبگات بەڵکو دەبێت تەنیا بیتر سێنیت بۆئەوەی جارێکی تر هەڵەی لەو جۆرە نەکات ، هەروەها ئەم پەروەردەکردنەش زیاتر دەچێتە ئەستۆی دایك و باوك دەبێت مناڵەکانی پەروەردەبکات ، هەروەك لەم پەندەی خوارەوە مندا لێك ئامۆژگاری دایکی دەکات، (دایە دەستم بکە کیسە، تاخەرك نەخوم) واتا دایکە باش پەروەردەم بکە باکاری چەوت نەکەم فێری خراپە نەبم ، لەلای هەمووخەڵکیش منداڵ دەبێت لە منداڵیەوە بخرێت ژێر چاو دێری دایك وباوکی بۆئەوەی مناڵێکی باش دەرچێت و پەروەردەیەکی جوان بکرێت بۆئەوەی لەدوارۆژدا ببێتە تاکێکی کارای ناوکۆمەڵگا.

# ﴿دەیگەیشتن خوەشترە ، لەپلاو خواردن﴾

لەسەردەمی کۆن دا برنج خواردنێکی دەگمەن بوەو هەموو خێزانێك نەیتوانیوە بەدەستی بهێنێت و بیخوات هەربۆیە بەخواردنێکی دەگمەن ناسراوبوە. ئەم پەندەش ئەوەمان پێ دەڵێت کە لەدانیشتن و کۆڕو کۆبونەوەکاندا تێگەیشتن باشترە لە خواردنی پلاو برنج کە ئەوسا بە ئاسانی دەست نەدەکەوت،بەواتایەکی ترئەگەر قسە بۆکەسێك کرا کەسەکە لێ ی تێنەگەیشت پێی دەگوترێت تێگەیشتن باشترە لە پلاو خواردن.

## ﴿ دەوەل سەگا ڕەو بەیك، دەوەل گورگا گوشت خوەیك﴾

لە کوردەواریدا و بەتایبەتی لەکارو باری ئاژەڵداریدا سەگ وەك پاسەوانی مەڕومالاَت بەخێوکراوە، هەڵبەتەگورگیش بەو هۆیەیی گیاندارێکی گۆشت خۆرە و بۆتێرکردنی سکی لەڕاودایەو زیاتر ویستی خۆتێرکردنی لەسەر مالاَتی بێدەسەلاَتی وەك مەڕو بزنە، ئەم پەندە ئاراستەی ئەو کەسانەیە کە هەم لەگەڵ سەگ ئەرکی پاسەوانی مەڕومالاَت لە ئەستۆ بگرێت لە هەمان کاتدا لەگەڵ گورگدا بە نهێنی لە نیوەشەودا لە مێگەلە مەڕبدات و لەگەڵ گورگەکە گۆشتی مەڕەکان بخوات، لەناو کۆمەڵگەش ئەم جۆرە خەڵکە هەن کە هەڵگری هەمان خاسیەتن کەلە ناو خۆدا وەك نیشتمان پەروەر و دڵسۆز خۆی نمایش دەکات و لەڕاستیشدا لەگەڵ دووژمن دەستی تێکەڵەو بەشدارە لە هەموو کردارێکی ناحەزانەی دووژمن.

# ﴿ ماسی گرتن بیٚ قوین تەڕبین نیٚ بووك ﴾

لێكدانەوەو واتای ئەم پەندە ئەوە ئەگەیەنێت كەمرۆڤ بۆ گەیشتن بە ئامانجەكانی دەبێت تیٚ بكۆشێت و ماندو بێت ئینجا بگات بە ئەو شتەی كەهەوڵی بۆداوە بۆیەش باس لەماسی كراوە، چونكە ماسی گرتن یان ڕاوكردنی ماسی شتێكی وائاسان نیە ئە بێت شارە زایی باشت هەبێت و لە هەمان كاتدا مەڵەوانی باشیش بزانیت، چونكە دەبێت لەناوئاودا ڕاوی ماسی بكەیت نەك لەوشكانیدا بۆیە دەڵێت (بیٚ قوین تەڕبین نیٚ بووك )واتا دەبێت چەند پێویست بكات خۆتی بۆ تەڕ بكەیت ، ئەم پەندە زۆر جار بەو كەسانەش وتراوە كە بەتەمای كارێكن بەڵام خۆیانی بۆماندوو ناكەن تەنیا شانێكیانی بەبەردەدەن و كەم تەرخەمن لەكارەكانیاندا.

## ﴿ هەتا تویم نەکەی نیّ دویر نیەوە ﴾

وتاو شیکردنەوەی ئەم پەندە ئەوە دەگەیەنیّت هەموو کەسیّك هەتا هەوڵ و کۆشش نەکات، کاریّك نەکات ماندوو نەبیّت تیایدا بەرهەم هەڵناگریّت و ناتوانیّت بەرهەم بەدەست بیّنیّت، ئەم پەندە ئەوەمان بەبیر دەهیّنیّتەوە کەمرۆڤ پیّویستە هەوڵ بدات لەژیاندا بۆ گەیشتن بە ئامانجەکانی ئەگینا هیچ کاریّك سەرکەوتوو نابیّت ئەگەر هەوڵی بۆنەدەیو لە پیّناویدا ماندوو نەبی .

## ﴿ بزنیك بقاڕیك کەوچکیك دووی هەبووك ﴾

لەم پەندەوە دەگەینە ئەو ئەنجامەی کە کەسا نیّك هەن لە ناو کۆمەڵگە جگە لە هات و هاوارو کیّشە نانەوە هیچ سودیّکیان نەبۆخۆیان نە بۆخەڵکی تر هەیەو پەندەکە ئامۆژگاریان دەکات دەست هەڵگرن لەو ڕەفتارو هەڵسو کەوتە خراپانە.

## ﴿دەوڵەمەندی وەك چڵك دەستە﴾

شیکردنەوەو لێدانەوەی ئەم پەندە واتا چۆن چڵکی دەستت لێ دەبێتەوە کاتێك جوان بە ئاوو سابوون دەی شۆیت لەدوای ئەوەی کارەکەت تەواوکردوە کەبەهۆیەوە دەستت پیس بووە، ئاواش دەوڵە مەندی ئەگەر باش مامەڵەی لەگەڵ نەکەیت ئاوامالّەکەت لەدەست ئەبێتەوەو دەکەویتەوە دۆخی هەژاری، ئەوکات ئەرکی سەرشانت گرانتردەبێت، چونکە فێری ژیانی هەژاری نەبوویت هەر لە ژیانی دەوڵەمەندانە ژیاویت لەوانەیە توشی چەندان کارەسات و نەهامەتی ناخۆش بیت.

## ﴿ بیت بەمیر خاوا نەکەی لەویر﴾

ئەم پەندە بۆکاتی خۆی ڕێسایەکی گرنگ بوە بۆ میرو کار بەدەستان و ئەوانەی بەرپرسیارێتیان لەسەرشان بوە، ئەم پەندە پێیان دەڵێت نەکەن خەڵکی وڵاتی خۆتان و هەژارو نەدارو خواپەرستی لەبیر بکەن بە هۆی شکۆو دەسەڵاتانەوە، ئامۆژگاری ئەوانەش دەکات کە

پلەیەك لەسەروی خەڵكانی ترەوەن كە هیچ كاتێك خەڵكی تر بە كۆیلەو ژێر دەست نە زانن، چونكە هەموو ئەوانە یەزدان سەپاندویەتی بەسەرمرۆڤایە تیدا.

## ﴿ وەران بەپیری نێری بەكوری ﴾

ئەم پەندە ئاراستەی خاوەن ئاژەڵەكان كراوە و فێریان دەكات كە بۆ پەرەدان و درێژەدان بەكاری زاز زێ ی مەڕومالاتیان ڕەچاوی جۆرە سیستەمێك بكەن كە ئاژەڵداری لەسەری بنیات نراوە ئەویش ئەوەیە بۆئەوەی مەڕو بزن لە زاوزێ ی خۆی نەكەوێت و وەچەی باش بەرهەم بهێنێت پێویستە بەرانەكە تەمەنی خۆی بڕیبێت واتە تارادەیەك بەتەمەن بێت، چونكە بەرانی بەتەمەن جسنەو وەچەی باش دەدات هەروەها (نێری)یش تەمەنی گەنج بێت باشترە بۆئەوەی نەوەی باشتردەدات.

# ﴿ جفتیار عەرد ناسە بەڵام ساڵ ناس نیە ﴾

واتای ئەم پەندە جوتیار ئەتوانێت باشترین زەوی دەست نیشان بکات بۆ کشتوکاڵ کردنی دانەوێڵە ، جوتیارەکە بە پێی شارەزایی خۆی کەچەندین ساڵە خەریکی کشتوکاڵ کردنە زەویەکان و جۆری زەویەکان باش دەنا سێت بۆ کشتوکاڵ کردن وەچ جۆرە بەرو بۆمێکیان لێ بچەنێت گەنم یاخوت جۆ، بەڵام ساڵ ناس نیە واتا نازانێت ئەم ساڵ باران چۆنە وەکەش وهەوا چۆنە ئایە زستانێکی ساردوو باراناویە یان بارانی کەمە و وشکە ساڵیە، چونکە ئەمە کارێکە پەیوەندی یە یەزدانەوە هەیە ئەگەر بباریێت یان نا ؟

# ﴿گورگ لە کوز خوەتا بووك قەت لە حەقی نیایی﴾

لێکدانەوەو شیکردنەوەی ئەم پەندە مەبەست لەکەسی خراپە لە نێوعەشیرەت و بنەماڵەکاندا کەهەردەم کەسێکی گونجاو نەبووە یان لەرێلادەر بووە لەکارو فەرمانەکاندا لەدژی خێڵ و بنە ماڵەکان رەفتاری کردوە ، ئەمەش زیاتر دەگەرێتەوە بۆ سەردەمی خێلایەتی و عەشیرەت گەری کەلە ناو عەشیرەت یان خێڵ کەسێك بەرپرس بوە لەکارو بارەکان بەلاّم لە تەك ئەمەشدا کەسێکی خراپ هەبووە کارەکانی ناشرینکردوە یان ئاژاوە چی بووە لەگەڵ کەس وکاری خۆیوو بنەماڵەکەیدا، ئەوانیش لەبەر ئەوەی هی خۆیان بوە لەپشتی خۆیان بوە خۆنای کوژن بۆیە بەسەریاندا زاڵ بووە لە سەردەمەکانی پێشوتر کەیاسا بەم شێوەیە بەر قەرارنەبوە بۆیەش ئەم پەندەیان بۆ وتوە.

# ﴿لەچەم دار ڕاست و دار چەفتیش هەست ﴾

واتای ئەم پەندە لەناو هەموو دارستانێکدا داری ڕاست وداری چەو تیش هەیە ، وەهەروەها لەناو کۆمەڵگاشدا کەسی باش و کەسی خراپیش هەیە، ئەم پەندە بەدوو واتا دێت، یەکەمیان باسی کەسێك بکەیت کەشیاوی ئەوە بێت باسی بکەیت، بەڵام دەبێت لە بنەماڵە یەکی خراپ بێت، دوەمیان بەو مانایە دێت کەبنەماڵەیەکی زۆر باشن بەڵام کەسێکی زۆر خراپ و بەد ڕەوشتیان هەیە، ئەم پەندە لەگەڵ ئەو پەندەدا یەك دەگرێتەوە کەدەڵێت: ( چەم بێ چەقەڵ نابێت)

# ﴿ هەر ڕووژیك هالەبان ئاخوڕیك ﴾

واتاو شیکردنەوەی ئەم پەندە مەبەست لەو جۆرە کەسانەیە کە هەر ڕۆژەو لەلایەکن یان ڕونتر بلێین هەر جارەو تەرەف گیری لایەکن بەکورتی هەرلایەنێك لەسەرەوە بێت یان براوە بێت لەگەڵ ئەو لایەنەدان واتا بەگوێرەی بەرژەوەندیە شەخسیەکانی خۆیان دەجولێنەوە ئەم جۆرە کەسانە کەسی هەل پەرستن دایم بەوریایەوە لەڕوداوەکان دەڕوانن زیاتر تەرکیزیان لە سەر بەرژەوەندیەکانی خۆیانە ئینجا چ لەبواری سیاسیدا بێت یان لەبواری کۆمەڵایەتیدا بێت یان لەبواری ئابوری دا بێت.

## ﴿ سێبەر بەردوو بەقای مێرد وەك یەكە ﴾

واپێ دەچێت ئەم پەندە ژنێكی بەهرە مەند گوتبێتی و لەسەرزاری خەڵك بۆنەوەی ئێستا گوازراوەتەوە، ئەم پەندە ڕەخنە لەو پیاوانە دەگرێت كە ڕێز لەژن ناگرن و نرخی ژن لایان كەمە و هیچ بەهایەكی نیە، ئەو جۆرە پیاوانە هەمیشە لە فێڵ و تەڵە كەبازی و خەڵەتاندن و بەلاڕێدا بردنی ژنەو بە چاوی نزم تەماشای ژن دەكەن، پەندەكەش واپێناسەی ئەو جۆرە پیاوانەی كردوە كەوەك سێبەری بەردن واتە سێبەری بەرد چەندبێ سودو بێ كەڵكە و هەمیشە سێبەرەكەی كەس خێری لێ نابینێت بەهۆی كەمی سێبەرەكەیەوە.

# ﴿ هەتا مار نەخزیکە باخەرت
# نێ تو ێنیك بخزیکە حارت﴾

لێکدانەوەو شیکردنەوەی ئەم پەندە ئەو مەبەستە ئەگەیەنێت تاوەکو کوڕ ژن نەهێنێت و ژنەکەی فێری تەڵەکەبازی و فڕو فێڵی نەکات لەگەڵ دایك و باوك و خوشك و براکانیدا بەخۆشی دەژیان ، ژیانێك پڕ لە خۆشی و کامەرانی بەڵام کاتێك ژنەکەی دەست دەکات بەبەهانەگرتن و نارەزایی دەربڕین بەرام بەرماڵی باوکی کوڕەکە و هەموو ڕۆژێك دەی کات بەقرە قڕ لەگەڵ خەسوی و قسەی ناشرین بەك گوتن ئەوانەو خێزانە، لەجیاتی بەختەوەریو ژیان پڕدەبێت لە نائارامی ناتەبایی و وشەی ناشرین بەیەك وتن تەنانەت زۆر بەی جار کوڕ پەشیوان دەبێت لە پێك هێنانی ژیانی هاوسەریدا.

# ﴿ ئەگەردیاك بابیاك دەنا خەوم دیاك﴾

شیکدنەوەو لێك دانەوەی ئەم ووتە بەنرخە دەگێرنەوە لە باب و باپیرانەوە لەسەردەمانی کۆندا خانەوادەیەك ژن ئەگوازنەوە بۆ یەکێك لەکوڕەکانی دوای داوەت کردنی خەڵکی ئاوایی و حەوت شەوو ڕۆژ ئاهەنگ و شایی و دەهۆڵ کوتان لە ئێوارەی کۆتای کەبووك هاتۆتە ماڵی زاوا و چاوەڕوانی قەفەزیی زێڕینە کە جەنابی زاوا بچێتە پەردەی بوکێنیەوە ئەو کات عادەت وابوو لەلایەن خزم و کەسانەوە بە کاکی زاواین دەوت بفەرموو بۆلای بوکەخان وادیارە لەبەر شەرمنی زاوا یان گێلی و دەبەنگی زاوا بوکەخان ئەم قسەیەی پێ وتوە بۆ ئەوەی هەر هیچ نەبێت کاکی زاوا غیرەت بیگرێت.

# ﴿ کی کفتەو تورش خواردیە
# بائەوەبچوکە لای بووکیٚ ﴾

ئەم پەندە ئامۆژگاری دایکان و باوکان دەکات کەلە کاتی ئاهەنگی هاوسەرگیری بۆکورەکانیان وریابن زاوا پشت گویٚ نەخەن، وادیارە پەندەکەش لەڕووداوێکی لەو شێوەیەوە گوتراوە. دیارە لەزەماوەندێکی هاو سەرگیریدا دوای ئەوەی بۆماوەی حەوت شەوو حەوت ڕۆژ لەشایی و هەڵپەڕکیٚ ئەو ئێوارەیەیی کەبوك دێتەماڵەوە دایك و باوکی زاوا لەگەڵ هەموو ئەوانەی داوەتی ئاهەنگەکە کراون دەست دەکەن بەنان خواردن و لەبیریان دەچێت خواردن بۆ کاکی زاوا ئامادەبکەن ، دیارە زاواش زۆر برسی دەبێت و شەرم دەیگرێت داوای خولردن بکات، شەو درەنگ دادێت دایکی زاوا دەچێتە لای کوڕەکەی و پیێی دەڵیٚ: ئەوە هێشتا نەچویتەلای بووك؟ زاواش لەڕقاولەبرسا دەڵیٚ: کیٚ کفتەو ترشی خواردوە با ئەو بچێتە لای بووك.

# ﴿ کوس بە قەرماسنگ پاس نێکریاك ﴾*

شیکردنەوەی ئەم پەندە و لێکدانەوەی بەشێوەیەکی زانستی مەبەست ئەوەیە ئافرەت دەبێت خۆی لەڕوی خوڕەوشت و لایەنی کۆمەڵایەتیەوە کەسێکی بە ڕەوشت بێت ئەگینا بە نیازی پاسەوانی لێکردن و چاوەدێری کردن بێت لەلایەن خاوەنیەوە نابێت، چونکە ئەو ئیشی خۆی هەردەکات لەبنەوە بەدزی بێت یابە ئاشکرا.سەرچاوەی وتنی ئەم پەندەو قسە بەنرخە بۆمیان گێڕایەوە کە ئافرەتێکی زۆر جوان لە ماڵەباوان دیارە هەرچی هاتۆتەداوای بەکەس ڕازی نەبوە دۆستی خۆی هەبوە براکانیشی زۆر وریاداریان دەکرد بۆئەوەی شەرمەزارنەبن لە ڕوی خەڵکدا دایم لە چاوە دێری خوشکەکەیان بوون تەنانەت کەدەچوە سەر ئاویش دیارە ڕۆژێکیان کچەکە بۆتاقی کردنەوەی براکانی بەبرایەکیان دەڵێت شەوە وەرەلەگەڵمدا دەچمەناو ئەو هۆڵەوە ناوکادینەکە میز دەکەم دیارە پێشتر مەوعیدی داوەتە دۆستەکەی بۆت دێمەناو کادینەکە لە دەرگای کادینەکە دەرپێکەی پێی بەلای براکەیەوە دادەنێت و دەروا ئیشی خۆی دەکات براکەش لەچاوەدێری بوو کچە ئیشی خۆی لەگەڵ دۆستەکەی تەواو کردوو

ئینجا گەڕایەوە بەبراکەی ووت برام هیچ هەبوو براکەیشی ووتی من لێرەم پیاو هەیە بەم ناوەدا بێت. بۆیە پێشینان جوانیان وتوە (کوس بە قەرماسنگ پاس نێکریاك).

* *قەرماسنگ:* باشترین چەکی ئەو سەردەم بوە کەئەم پەندەی تیاگوتراوە بۆیە لەبەرامبەر پاراستنی شەرەف و ناموس ئەو چەکەیان بۆپارێزگاری لێکردن داناوە.

# ﴿ هاتم بگەمە مراد قیامەت لەم ڕابی﴾

واتای ئەم پەندە مەبەستی حەزوو ئارەزووی ئەو کەسەیە پێش ئەوەی پێیبگات بەو کارە یاخود ئەو شتەی کەحەزی لێیەتی چەندان ساڵە بەئاواتەوەیە بۆی هەوڵی بۆ ئەدات چاوەڕوانی ئەوڕۆژە پڕلەخۆشی و شادیە یە لەژیانیدا، بەڵام مردن ئەو بوارەی نادات کەسەکەکۆچی دوایی کردوە نەی توانیوە بەو ئاواتانەی بگات کەبەر لەکۆچی دوایی بۆی ماندوو بوەو کاری بۆکردوە.

# ﴿ قاپی کەس مەکوت تاقاپیت نەکوتیاك ﴾

بەو هۆیەیی لەڕۆژگاری زوەوە تا ئەمڕۆش دەردو نەخۆشیە کۆمەڵا یەتیەکان و لادان و هەڵە و کێشە کۆمەڵا یەتیەکان بنبڕ نەکراون ، باب و باپیرانمان بەم پەندە وریامان دەکەنەوە لەوەی خۆمان بپارێزین لەهەڵەو کەم وکوڕی بەتایبەتی لادانی کۆمەڵایەتی و پێمان دەڵێت بۆلە کەدارکردنی ناوبانگی خەڵك لەدەرگای هەرکەسێك بدەیت، ئەواسەرەنجام لەدەرگات دەدرێتەوە و لەکەدارت دەکەن بۆیە واباشترە خۆتان لەلادانی کۆمەڵایەتی بپارێزن.

# ﴿ئەگەر خودا دابەت هەی هەی مەکە
# ئەگەریش نەدابەت وەی وەی مەکە﴾

لێکدانەوەو واتای ئەم پەندە مەبەست لەوەیە ئەگەر خودا رزقێکی باشی پێدایت بویتە خاوەن پارەو ماڵێکی زۆرو باش زۆر دڵت پێی خۆش نەبێت و بگەیتە ئەو حالەتەی کەکردەوەی خراپی پێبکەیت و لە کاری نەشیاو بەکاری بێنیت و لەخۆبایی و بوغرابونت بگاتە ڕادەیەك خودای گەورەت بیر بچێتەوە، بەشی دووەمی پەندەکەش ئەوەباس دەکات ئەگەر خودای گەورە ڕزق و ڕۆزیەکی باشی نەدا پێت دەستت کورت بوو ناڕەزایی دەر مەبڕەو ناشوکر بیت لەبەرامبەرخودادا، چونکە بیرت نەچێت خودا خاوەنی ئەم کەونەیە بەشێکی کۆمەڵگای دەوڵەمەندو بەشێکی تری هەژار دروست کردوە.

## ﴿ پارە لە نووکیسە قەرز ئەگەر قەرزیشی کردی خەرجی مەکە﴾

ووشەی (نوو) لە شێوە زاری دەربەندیدا واتای (نوێ) دەگەیە نێت، پەندەکەش دەڵێت پارە لەکیسەی نوێ (تازەماڵ) قەرز مەکە، خۆئەگەر قەرزیشت کرد بەناچاری، ئەوا هەوڵ بدە هەمووی سەرف مەکە، ئەم پەندە ئامۆژگاریمان دەکات کەدەست بلاوی نەکەین و سامانی خێزان بەهەدەر نەدەین و وریا بین و ڕەچاوی باری بژێوی ئەو کەسانە بکەین کە قەرزیان لێ وەردەگرین.

## ﴿ هەرچەندە کەمەت بەرۆك هەردبیەوە پاڵدوی﴾

زۆر جار پیاوە ژیرو بەتەمەن و ڕیش چەرموەکان ئامۆژگاری خەڵکی لاسارو بەدڕە فتاریان کردوە تائەو خوو نەریت وڕەفتارە خراپانە دووبارە نەکەنەوە و مامە ڵەیان لەگەڵ کەسو کارو هاوسێ و دەورو بەریان باش بکەن، بەڵام ئامۆژگاریەکان تەنها چەند ڕۆژێك کاری خۆی کردوە و دواتر گەڕاونەتەوە سەرهەمان خوو نەریتە خراپەکانیان، ئەم پەندەش پیاوە گەورەکان ئاراستەی ئەو کەسانەیان کردوە کە تەنها بۆچەند ڕۆژێك ئامۆژگاری پیاوە ژیرەکان وەردەگرن.

## ﴿ ووشکە وەرد لەبان بەرد خاوەندی نێکەیك نامەرد﴾

مەبەست لەم پەندە واتا ئەگەر زەویەك لەلایەن خاوەنەکەیەوە لەساڵی پێشوتر لەوەرزی شۆبڕیندا بەباشی شۆی بڕدرا بێت بەشێوەیەکی زۆر جوان کێڵدرا ئەوابۆ ساڵی داهاتو کە جوتیارەکە لەوەرزی داچاندنی گەنم وجۆدا یان هەر جۆرە کشتو کاڵێکی تردا ئەو زەویە بەرهەمێکی باشی دەبێت بۆجوتیارەکە، چونکە لە ماوەی ساڵی ڕابردوو بەدرێژایی ساڵەکە بەرتیشکی ڕۆژ کەوتوەو ئاوی باشی وەرگرتوە لەوەرزی زستاندا هەرچی کرم و نەخۆشیەك هەبوە لەناو خاکەکەدا لەناو چوە و ئامادەکراوە بۆ بەرهەمێکی باش پێش کەش بکات بەجوتیارەکە. ئەم پەندە ئامۆژگاری جوتیارەکانمان دەکات کە بەو شێوەیە کاری کشتوکاڵی بکەن و هونەرو دەست ڕەنگینی و شارەزایی تیا بەکار بهێنن.

## ﴿ گالە چێر خوەت کوڕ لە کێر خوەت﴾

باپیرانی کورد لەگوتنی ئەم پەندە مەبەستیان ئەوەیە بۆ ڕاپەڕاندنی هەموو کارێك و دروست کردنی هەموو پەیوەندیەکی دروست و تۆکمەو بۆڕێکخستنی ژیان و گوزەران بە شێوەیەکی ڕێك و پێك هەمیشە پشت بەو کەسە ببەستە کەلە بنەچەوە لێت نزیکە بۆنمونە باوك واباشترە پشت بەکوڕی خۆی ببە ستێت لە کەسێکی تر باشترە ، لەم پەندەش دا گا کراوەتە نمونەیەکی زیندوو کەلە مانگای خۆماڵی بێت باشترە وەك لە مانگای شوێنێکی ترکە هیچ شارە زاییە کت لیّ ی نیەو نازانی چۆن پەروەردەکراوە؟

## ﴿ گاجفت نێکەیك جفتیار منێ کەیك﴾

لەسەردەمی زووداو تەنانەت ئێستاش خەڵکانێك هەن بۆ ئەنجام نەدانی کارێکی باش یاخود بۆنەکردنی ئەو ئەرکەی پێیان سپێردراوە چەند بیا نویەکی لاوازدە هێننەوە ئامانجیش لیّ ی خۆدزینەوەیە لە کارەکە نەك هیچ ڕێگریەك، دەڵێن باوکێك بەکوڕەکەی گوت: سبەی فلان پارچە زەوی بکێڵە بەڵام کوڕەکەی دەڵیّ ئاخر باوکە دوێنێ شەو هەوربوو.

# ﴿ گای باری لەمنداڵی ﴾

شیکردنەوەو لێکدانەوەی ئەم پەندە مەبەست ئەوەیە لەسەردەمی کۆن لەگوندەکاندا باب و باپیرانمان کەخەریکی کاری کشتوکاڵی بوون، زۆربەی کارو باری ڕۆژانەیان بەتایبەتی کێڵان و جوت کردنی زەوی کشتوکاڵی بەگا ئەنجام دەدرا بۆیە باشترین شت بەلای ئەوانەوە کەهەوڵیان بۆیدابووایە گای جووت بوو بۆیەدەیات گوت گایەك لەمنداڵی واتالەگۆلکیەوە لەماڵی خۆت پەروەردەی بکەیت بۆت بەدەردەکەوێت کە ئەمە بۆباردەبێت یان نا واتا لەگۆلکە ساواییەوە بەدیاردەکەوت کەبەکەلك دێت یان نا بەگوێرەی گەشە کردن و هەڵکەوتنی ئەمە سەرەڕای پەروەردەکردن و گرنگی پێدانی لەلایەن خاوەنەکەیەوە.

## ﴿ گایریاو خوەت لەنەگایریاو خەڵك باشترە ﴾

لەئەنجامی کەڵەکە بوونی ئەزمونی زۆرو بینینی دەیان ڕووداوی جۆراو جۆر باپیرانمان بەم پەندە جوانە خەڵکی خۆیان ئامۆژگاری کردوە بەوەی خەڵکی گوندو ناو چەو شاری خۆت خۆشتر بو یّت لە خەڵکی شو یّنیّکی تر خۆ ئەگەر کەموو کوڕیە کیش هەبوو هێشتا لە خەڵکی شوێنی تر بۆ گوندو ناو چەکەیان باشترن.

## ﴿هەڵگرتن بەردگەورە نیشانەی نەهاویشتنیە ﴾

کەسانێك هەن لە کۆمەڵگە هەمیشە بەرانبەر بەرڕوودانی کێشەو گرفتەکان پەنا بۆ هەڕەشەو ووتەی ناشایستە و تۆڵە کردنەوە دەبەن کەلە ڕاستیشدا ئەو کەسە نین کە بتوانن هەڕەشەکانیان بگەیەننە سەریان بتوانن تۆڵە بکەنەوە، جا ئەم پەندە ئەو جۆرە کەسانەمان بەو گونەیە پێ دەنا سێنێ و پێمان دەڵێت: ( هەڵگرتنی بەردی گەورە نیشانەی نەهاویشتنیەتی)

# ﴿ تیکە لەدەم وەردەوەبووك بکەفیکە داوان﴾

بەشێوە زاری دەربەندیەکان بە پارو دەگوترێت( تیکە) ئەم پەندەش تیکەی کردۆتە نمونەیەکی جوان و دەڵێت : ئەگەر پاروو لەدەم کەوتە خوارەوە بکەوێتە کۆش باشترە وەك اەوەی بکەوێتە سەرزەوی ، ماناکەیشی فراوانەو لە چەندین ڕووەوە مانای خۆی دەبەخشێت* ژنێکی مێرد مردە بدرێتەوە بەگەنجێکی ناو بنەماڵەی مێردەکەی خۆی باشترە لە کەسێکی تر* زەویەك کە دەفرۆشرێت بدرێت بە خزمێك لە بنەماڵەکەی خۆی باشترە لە کەسێکی تر* بەرهەمێکی کشتوکاڵی بدرێت بە هاوسێ یان خزمێك باشترە لە کەسێکی دوور، * خێرو خێرات و سەدەقە بدرێت بە هەژارێکی خزم باشترە لە هەژارێکی بێگانە، ئەمانەو چەندین مانای تردەبە خشێت.

# ﴿ مێوان وەی بی سەگیکیش بەی بی﴾

ژیانی سەردەمی جارانی خەڵك ژیانێكی شێوە چەرمەسەری بوە و بەهۆی نەبوونی و نەداریەوە هەموو خێزانێك كەلو پەلی خەوتن و خواردن و پێدا ویستیەكانی ژیان تەنها بۆ ئەندامانی خێزانەكەی خۆی دابین بكات و نەیتوانیوە هەموو كەرەستەیەكی زیادەی هە بێت تالە كاتی هاتنی میوانی زۆردا پەكی نەكەوێت، دیارە ئەم پەندە باس لە خێزانێك دەكات كەلە كاتی هاتنی میوانێكی زۆر نەیان توانیوە وەكو پێویست خزمەتی هەموو میوانەكان بكەن، وادیارە میوانەكان جگە لە خۆیان كەرێك و سەگێكیشیان پێ بووە، ماڵی خانە خوێ بە هۆی نەداریان نەیان توانیوە كەرو سەگەكەش تێربكەن، جا ئەم پەندە ئامۆژگاریمان دەكات و پێمان دەڵێت كاتێك كەبونە میوانی كەسێك ڕەچاوی بارو دۆخی ژیانیان بكەن و لە توانای خۆیان زیاتر داوایان لێ مەكەن بازۆر نەبنە ئەرك بەسەریانەوە.

# ﴿ ئەگەر دار لاربووك سێبەرەكەیشی لاردبووك﴾

ئەم پەندە ئەوەما پێ دەڵێت ئەگەر باوكێك خۆی خراپ بێت، كەسێكی ئاژاوە گێڕ وو داوێن پیس و ناكەس بەچەو نا پیاو بێت هەموو سیفە تێكی تیا بێت، ئەوا كوڕەكەیشی وەك خۆی پەروەردە دەبێت و هەمان ڕێچكەی باوكی دەگرێتەوە، خوڕەوشتی باوكی لەمنداڵەكەیدا دووبارە دەبێتەوە، بۆیەش لەكوردەواریدا بەدو شێوە وەسفی ئەو جۆرە كەسانە كراوە وەك( گیا لەسەر پنجی خۆی دەڕوێتەوە) واتا باوك چۆن بێت منداڵەكەشی وەك خۆی دەردەچێتەوە، تاڕادەیەك زانستیش پشتگیری ئەم بۆچونە دەكات و بۆماوەیی كاریگەری هەیە لەسەر گواستنەوەی سیفەتی باوك ودایك بۆمنداڵ.

# ﴿خوین بەخوین نێشوریاك﴾

باپیرانمام لەم پەندەدا ڕێگەی ڕاستی ژیان و ئاشتی و تەبایمان پێ نیشان دەدەن و دە لێن کاتێك ڕووداوێکی کوشتن یان شەڕ یان هەررِوداوێکی تری ناخۆش لە نێوانتان ڕوویدا لە یەکتر ببورن، چونکە پەنا بردن بۆ تۆڵە کردنەوە هەمیشە ناکۆکیەکاان قوڵتر دەکات و ویژدا نیشتان ئاسودە نابێت، باشترین چارەسەر ئەوەیە لەیەکتر ببورن تاخەڵکی تریش چاوتان لێ بکەن و چیدی کێشە ڕوونەدات لە نێوانتاندا. ئەم پەندە پشت ئەستورە بەبنەماکانی ئاینی ئیسلام و ئامۆژگاریەکانی.

# ﴿ماڵ لەخوەی نەبی میٚوانیشی بی﴾

ئەم پەندە (ماڵ لە خۆی نەبوو میوانیشی هات) لە چەندین دیوی جیا جیا ماناو شیکاری هەڵدەگرێت:

*گەنجی نۆماڵ کەرەستەی خەوو خواردنی تەنها بەشی خۆی و هاوسەرەکەی دەکات کەچی دوو خێزان ببنە میزانی .

*کەسێك نەخۆش و کەمدەرامەت و نەبوون بێت و خەڵك خێرو زەکاتی بدەنێ کەچی مانگاکەشیان مردار بێتەوە.

* کەسێك لەگوندێکدا ڕەێنجبەرو کرێکاری خەڵکەو نەبوون وکەم دەرامەتە و تەنها یەك بزنی دەبێت کەچی گورگ کەلە ڕانەمەڕێك دەدات تەنها بزنی ئەو کەسە دەخوات.

*هەژارێك کەنان پەیداکردنی تەنها لەسەر بازووی خۆیەتی کەچی لەکاتی کارکردندا قاچی بشکێت یان دەستی بشکێت.

# ﴿پاساری خوەی هەست تاچەلاوی هەبووك﴾

لە شێوەزاری دەربەندیەکاندا بەچۆلەکە دەڵێن (پاساری) ، باڵندەی پاساری گۆشتی زرکەمەو جەستەیەکی لاوازو بچوکی هەیە، ئەم پەندە برگەی چۆلەکەی کردۆتە نمونەی پەندێکی بەسود تا پێمان بڵێت هەندێك کەس لەناو کۆمەڵگەدا سودیان بۆکەس نا بێت و هەوڵی چاکەو پیاوەتی نادەن و هەربۆیە ئەو جۆرە کەسە بە چۆلەکە شوبهێنراوەکە خۆیان هیچ لەباردا نەبوون ناکرێ چاوەڕێ ی چاکەو پیاوە تیان لیّ بکرێت.

# ﴿میوان ناوەخت نانی هالەسەرخوەی﴾

ئەم پەندە بەدوو جۆر لێك دەدرێتەوە:

* ئەگەر کەسێك لە کاتێکی درەنگ واتە کاتی ژەمە نان خواردن نەبێت و ببێتە میوانی کەسێك ئەوا ئەگەر نان ئامادەکردنەکە درەنگیش کەوت و لەسەرخۆ نان ئامادە کرا ئەوا خانە خویێ بەرپرسیار نیە، چونکە میوانەکە خۆی درەنگ هاتوەو خواردنەکەش لەسەرخۆ پێدەگات.

*ئەگەر کەسێك نێزیك ژەمی نان خواردن بووبە میوانی کەسێکی تر خواردنەکەیان هەرچیەك بێت خاوەن ماڵ بەرپرسیار نیە و میوانەکەش بەو خواردنە ڕازی دەبێت.

## ﴿کەشکیش برای دووە﴾

دووکەس یان دوو هاوسێ یان دوو هاوڕێ هەڵگری زۆر خاسیەتی وەك یەكن جا چاك بێت یان خراپ، کا تێك کە پرسیار لە کەسایەتی یەكێكیان دەكرێت بە هۆی کەسەکەی ترەوە ئەو ساپێیان دەگوترێت کەشکیش برای دۆیە، واتە هەردووکیان هاو خاسیەتن.

* کەشك و دۆ دووبەرهەمنی شیرە مەنین لەکوردەواریدا خەڵكی گوندەکان و ڕەوەندەکان زۆر گرنگیان پیّدەدا.

## ﴿شەڕئەو دولەمەیارە ئەی کۆڵە﴾

با پیرانمان لە ڕێگەی ئەم پەندەوە ئامۆژگاریمان دەکەن و پیّمان دەڵێن ئەگەر کێشەیەك لە نێوان دوو کەس یان دووبنەماڵە یان دوو بەرەباب هەبوو، هەوڵ بدەی ببیە لایەنگری لایەکیان کەبەهۆی ئەو لایەنگریەوە کێشەکە دەگوازرێتەوە بۆناو بەرەباب و بنەماڵەیەکی تر واتە شەڕی ئەو ماڵانە مەهێنە بۆ ناو ماڵی خۆت.

# ﴿ گاکەیکەی کەر خوەیکەی ﴾

زۆر جار بینیو مانە کەسانێکی لە خۆبوردوو پیاو چاك و دڵ باش کە دە مرێت ناوو ناو بانگەکەی یان سەروەت و سامانەکەی بۆ برایەکی یان کوڕێکی بەجێ دە مینێت کە شایستەی ئەو ناو بانگە نیەو ناتوانێ هەمان ڕۆڵ ببینێت، ئەم پەندە تێمان دەگە یەنێت کە کەسانی باش و پیاو چاك زۆر جار دوای مردنیان پیاوەتی و سەروەتەکەیان بەمیرات بۆکەسانێك بەجێ دەمێنێت کە شایستەی ئەو پایەو پیاوەتی و پیا هەڵدانە نیە.

# ﴿وەویلەی پالەڕکێ اللهُ اعلم نسیبت کێ﴾

ئەم پەندە بۆ ئەو کەسانە گوتراوە کە بەڕەهایی بڕیار دەدەن، مەبەست لە پەندەکە ئەوەیە ناشێت بەرلە ڕوودانی کارێك بەڕەهایی بگوترێت هەر ڕوودەدات ، چونکە ئەگەری هەیە ڕوونەدات بۆنمونە زۆر جار وارێکە کەوتوە کەبووك ئامادەکراوە ببێ بە خێزانی کەسێك بەڵام ڕووداوێك یان هەڵو یستێك بۆتە هۆی ئەوەی بووك و زاوانەبن بەهاوسەری یەکتر ئەو خزمایەتیە هەڵبوەشێتەوە.بۆیە باپیرانمان بەم پەندە جوانە ئەوەمان بەبیر دەهێننەوە زۆر جار بووك پای لەڕکێفی ماین بووە بەڵام خودا تەقدیری وابووە بوکە بەنسیبی زاوا نەبوە بوە بە نسیبی کە سێکی تر.

## ﴿ساوەر لەئاوکە ماین لغاوکە﴾

ئەم پەندە بە کەیبا نوەکانمان دەڵێت چێشتی ساوار ئامادەکردن و لێنانی زۆر ئاسانەو کابان دەتوا نێت زوو پێی بگە یە نێت ، بە تایبەتی بۆ ئەو حاڵەتانەی کە میوانی درەنگ وەخت ڕوو دەکاتە ماڵەکانیان . تەنانەت ئەگەر لەگەڵ گەیشتنی میوان بۆ ماڵیان تامیوانەکە لە ئەسپەکەی دادە بەزێت و ئەسپەکە دە بەستێتەوە کەیبان و دەتوا نێت چێشتی ساوار پێ بگە یەنێت.

## ﴿دەمی بەشیر سوتیاوە فولە ماستاوکەیك﴾

شیرو ماستاو دوو بەرهەمی شیرەمەنین هەردووکیان ڕەنگیان سپیە یەکیان بەگەرمی دەخورێت و ئەوەی تریشیان بەساردی، ئەم دوو بەرهەمی شیرە مەنیە کراوەتە کرۆکی پەندێکی بەنرخ ، ئەو کەسانەمان پێ دەنا سێنێت کە پێشتر لە کێشەیەکدا خەتابارکراوە بەڵام هەوڵ دەدات لە کێشەیەکی تر تێوە نەگلێت تا جارێکی تر خەتا بار نەکرێتەوە.

# ﴿ماین ناڵکریاك باگیر پاهەڵگریك﴾

شیکردنەوەی ئەم پەندە جوانە بۆدوومەبەست بەکارهاتوەو دوو واتا دەگەیەنێت کە جوانی ماین چەند لەلای خەڵکی بەتایبەت لەلای سوارچاك و تفەنگ چی زۆر بەنرخە بەگوێرەی باگیر کەئەویش ئاژەڵێکی ترە لەوجۆرە، بەڵام ئەم پەندە بە واتایەکی تایبەتی بەکار هاتوە کەمەبەست ئەوە بووە ئافرەتێکی جوان جلێکی جوانی بۆکراوە زۆر جوان بووە لەبەری بەشێوەیەك سەرنجی زۆربەی خەڵکی بەلای خۆیدا ڕاکێشاوە، لەهەمان کاتدا ئافرەتێکی تر وتویەتی بامنیش ئەو جلانە لەبەر بکەم بەڵام ئافرە تەکە بەهەمان جلەوە بەو شێوەیە جوان دەرنەکەوتوەو نەبۆتە جێگەی تێڕامانی خەڵك، جا بۆئەوەی ئافرەتەکە تەریق نە بێتەوەو بەخۆیدا نەشکێتەوە پێشینان گوتویانە ( ماین ناڵ دەکرێت باگیر پێ هەڵدە گرێت) .

# ﴿ ئەگەر نەدیابیباوم دارکت دمردم لەحەزرەت باوکت﴾

شیکردنەوەو لێکدانەوەی ئەم پەندە مەبەست ئەوەیە کەوا پیاوێك ژنەکەی زۆر خراپ بێت ئینجا خراپیەکەی دەمەزەنی بێت یان ماڵان گەڕی بێت یان ناشرین بێت ، بەڵام پیاوەکەی زۆر کەس بەحەزرەتیەوە بوو بێت، بۆیە ئەم پەندە بەمناڵەکانی وتراوە لەلایەن ئەو کەسانەی کەوا ناحەزی دایکی مناڵەکان بوونە، بۆیەش ئەم قسەیەیان بەمناڵەکە وتوە کەوا بزانێت باوکی پێشوتر چەند کەس بەحەزرەتیەوە بوونە بەڵام ژنەکەی وای کردوە کەوا خەڵك پیاوەکەشیان لەبەر چاو بکەوێت .

## ﴿ ئیش بەکیرە مەلەرزەو کوسە مەترسە نێبوك ﴾

شیکردنەوەو لێکدانەوەی ئەم پەندە جوانە واتای ئەوەیە ئەگەر بەتەمای ئیشێك بویت بیکەی نابێت بەلەرزە لەرزەو دڵەڕاو کێ بیکەیت، چونکە ئەگەرلە ئیشێکدا بە جورئەتەوە بەژداری نەکەیت ناتوانیت سەرکەوتوبیت ، ئەم پەندە هاندانە بۆئەو کەسانەی کەلە کارو کردەوەکانیاندا زۆر قەلەق و دودڵن هانیان دەدات کە باوەڕیان بەخۆیان بێت و بەجورئەتەوە کارەکانیان بکەن ، وەك ئەوەی لەکوردەواریدا وتراوە خۆ گیڤ کردنەوە نیوەی غیرەتە، بۆیەش وتراوە ئیش بەکیرە مەلەرزەو کوسە مەترسە نێبوك .

# ﴿ لە کێودان دەریکە ﴾

کەسا نێك هەن لەژیان دا بەتایبەتی لە سەو داو مامەڵەدا هەمیشە دوو دڵ و بە گومانن لە زیان و قازانج و ئیرادەی مامە ڵەکردنیان هێندە لاوازە کە نەتوانن مامەڵەیەکی دروست و بێ کێشە ئەنجام بدەن و هەمیشە ووشەکانی ( ئەگەر، ڕەنگە، دەکرێ، دەشێ) بەکار دە هێنێت بۆئەوەی لەکاتی پێویست دا بەتایبەتی لە حالەتی پەشیمان بوونەوە بتوا نێت بلێت مامەڵەکەم تەواو نەکردبوو، کە پاساوە بۆپاشگەزبونەوە. هەربۆیە پەندەکە پێمان دەڵێت مامەڵەتان ڕاست و دروست بێت و خاوەنی بڕیارو قسەی خۆتان بن.

# ﴿ تەڕەکاڵ چیە چاڵ مەگرەی بەماڵ ﴾

ئەم پەندە تایبەتە بە جوتیاران و پێیان دەڵێت لە کاتی تۆو کردن دا( گەنم و جۆ چاندن) هەوڵ بدەن بۆ گەنم و جۆ ووشکە وەرد ئامادە بکەن و پشت بە تەڕەکاڵ مەبەستن ، چونکە بەرهەمی ووشکە وەرد دوو هێندەی ئەو زەویە یە کە بە شێوەی تەڕەکاڵ تۆو دەکرێت، هەربۆیە پەندەکە جوتیاران تێدە گەیە نێت کە تەڕەکاڵ بە ماڵ نەزانن، چونکە ئەگەر بیکەنە چاڵیشەوە توانای بەرگە گرتنی نیەو دا نە وێڵەیەکی زەعیفەو زەرد دەبێت یان بۆگەن دەبێت.

# ﴿ وشکە وەرد لەبان بەرد خاوەندی نێکەیك نامەرد ﴾

لێکدانەوەی ئەم پەندە لەبەرامبەر ئەو پەندەی پێشو تر وتراوە کەباسمان کرد، بۆیەش واوتراوە وشکە وەرد ئەوەیە کەساڵی پێشو ئەو کەسەی کەزەویەکە ئەکاتەکشتوکاڵ زەویەکەی خۆی دەکێڵێت بۆئەوەی بەدرێژای زستانی ئەو ساڵە باران لێیٚ بدات و ئاوی پێویست هەڵ بگرێت بۆساڵی داهاتو ئەگەر وشکە ساڵیش بێت بتوانێت بەرو بومەکەی خۆی بدات بەدەستەوە، ئەمە پێچەوانەی تەڕەکاڵە کە دەوترا تەڕەکاڵ بیکەیتە چاڵ مەیگرە بە ماڵ، ئەگەر بەراوردێك بکەی بەم پەندانە ئەوا زۆر لە جوتیارەکانی ئەم سەردەمەش ئەو سیستەمی داچاندنەی پێش خۆیان پەیڕەو دەکەن کەواساڵێك دەی کەنە وەرد ساڵی دواتر دانەوێڵەی وەك گەنم و جۆو جۆرەکانی تری کشتو کاڵی لێدە چەنن.

# ﴿ لەعاقڵ عەقڵ وەرگر لەبێ عەقڵیش هەر عەقڵ وەرگر﴾

هەموو کەسێك کەلە دایك دە بێت تەنانەت گڕو گاڵ و دایەو بابەش نازانێت، بەڵام لەگەڵ گەورە بو نیداو بە هۆی ئەزموونی دەورو بەرو خەڵکی ترەوە دە بێتە خاوەنی ژیری و ئەقڵی خۆی ، ئەم پەندەش پێمان دەڵێت ژیری و ئەقڵ تەنها لە پیاوی ژیرو ئاقڵ وەرنا گیر یێت بەڵکو لە بێ ئەقڵەکانیش وەردە گیرێت، لە پیرێکیان پرسوە چی فێردەبیت لە بێ ئەقڵ؟ پیرەکەش لەولآمدا گوتویەتی هەرکارێکی نەشیاو و نەگونجاو کە بێ ئەقڵێك ئەنجامی دەدات تۆ وانەیەکی لێ فێر دەبیت و فێردەبیت کەهەمان هەڵەی بێئەقڵەکە دووبارە نەکەیتەوە.

# ﴿ دەیك لەناڵ و دەیك لەبزمار﴾

با پیرانمان هەر پەندێکیان ڕێکخستبێت ئامانجیان لێ ی ئامۆژگاری و سود وەرگرتن بووە، یەکێکی تر لەو پەندانە ( لە ناڵ دەدات و لە بزماریش دەدات) ئەم پەندە تایبەتە بەو کەسانەی لەیەك کاتدا دوو هەڵوێستی دژ بەیەك دە نوێنن بۆ نمونە لەکاتی بوونی کێشەی نێوان دوو کەس یان دوو بنەماڵەدا هەردوو. لایان بەخاوەن ماف دەزا نێت ، دە چێتە لای هەرکامێکیان دە لێت تۆ لەسەرمافی خۆتی بەمەش لە جیاتی چارە سەرکردن کێشەکە ئالۆز تردەکات.

# ﴿ لومەی کەس مەکە کە خوەت نەتوێنی نهێنی خوەت بپارێزی﴾

واتای ئەم پەندە بەنرخە مەبەست ئەوەیە کە تۆ خۆت کەسێك بیت قسەت لەلا گیر نەبێت نەتوانیت نهێی خۆت بپا رێزیت، ئەوا لۆمەی کەس مەکە کە نهێنی تۆیان نەپاراست، چونکە خۆت ئەو کەسە نیت کە جێگای متمانەی هاوڕێکانت بیت بۆئەوەی بتوانن نهێنیەکی خۆیانت لاباس بکەن ئەی لەبەرام بەردا چۆن چاوەڕێی ئەوەش دەکەیت کەوا نهێنی تۆ بپارێزن.

## ﴿ سەگ دز لەماڵیان بەبوڵە بوڵ دەرچوك﴾

ئەم پەندە ئەوەنیشان دەدات کە خەڵکا نێك هەن هەژارو کەم دەرامەتن و توانای خۆ بژێوییان نیە تەنانەت لە هەژاریدا سەگێکی دز سود لە ماڵیان وەرناگرێت بەهۆی هەژاری ماڵەکەوە، پەندەکە ڕوودەکاتە خەڵك و هەژارانیان پێ دەنا سێنێت تا دەوڵەمەندەکان بی ناسن و هاوکاری بکەن.

## ﴿ بە مێغنجیر وەتن ڕاوا چی بەعەردا، وەت لەتاو سەرم﴾

هەر پەندێك لەپەندە کوردیەکان بۆ مەبەستێکی تایبەتی یان زیاتر گوتراوە، ئەم پەندەش ئاراستەی ئەو کەسانە کراوە کە کارێك دەکەن بەویست و ئارەزووی خۆیان نە بێت، بەڵکو لە ژێر نا چاریدا ئەو کارە ئەنجام دەدەن، نا چاریەکەش یان لەبەر لۆمەی خەڵکیە یان لە حالەتی برسێتی یە یان لەبەر خاتری خزم و دۆستێکە. هەندێك جار ئەنجام دانی ئەو کارە تەنها قازانجی بۆکەسێك هەیە بەڵام کەسێکی تر لە ژێر ناچاریدا بەبێ ویستی خۆی کارەکە مەیسەر دەکات.

# ﴿ شەڕ دان سوبزی باشتزە لە خێردان ئیوارە ﴾

باپیرانی کورد هەمیشە بەم پەندە ئامۆژگاری نەوەکانی خۆیانیان کردووە کە هەوڵ بدەن هەرکارێك کەلە پێشیانە دانی بەیانی ئەنجامی بدەن تەنانەت ئەگەر قازانجیشی کەمتر بێت باشترە لەکاتی دانئێواران، چونکە پیاوە ژیرەکان هەمیشە ئەوەیان لەبەرچاو بوە دانئێواران هەرچەند کاتژمێرێکەو شەو دا دێت و ڕەنگە ئەو کارەی بیانەوێت ئەنجامی بدەن نەتوانن بەباشی بەڕێوەی ببەن.

# ﴿ زانایك بایك لەت باشترە لەوەی نەزانیك خزمەتت بکەیك﴾

ئەم پەندە واتایەکی بەنرخ بەدەستەوە دەدات و دەری دەخات کە باپیرانمان درکیان بەو ڕاستیە کردووە کەئەوەی مرۆڤ دەگە یەنێت بەئاوات و ئامانجەکانی زانست و زانیاریە هەربۆیەش لەم پەندەدا پێمان گوتراوە( زانایەك لێتبدات باشترە لەوەی نەزانێك خزمەتت بکات) واتە دوو ژمنێکی زانا زۆر باشترە لە دۆستێکی نەزان چونکە کە سێك ئەگەر دووژمنیش بێت بەڵام کەزانا بوو ئەوا سودی بۆ هەموو کۆمەڵگە دە بێت، بە پێچەوانەوە کەسی نەزان نەك هەر سودی بۆ خەڵك نا بێت بەڵکو بە هۆی نەزانینینەوە زیانیشی بۆخەڵك دە بێت.

# ﴿ ئەوەی بەتەمای مارەڵ بووك بەبێ شیم سەرنەیکەوە ﴾

زۆرکەس هەن لە ناو کۆمەڵگادا هەمیشە لە ڕاپەڕاندنی ئەرك و فەرمانی ڕۆژانەو کاری هەرەوەزی خۆیان دەدزنەوە و دەیانەوێت خەڵکی تر لە جێی ئەوان ئەو کارە بکات تەنانەت بۆکارو.باری خۆشیان وا فێر کراون کەکەسێکی تر ئەو کارەیان بۆ جێ بە جێ بکات ، بەڵام ئەزموونی با پیرانمان سەلماندوویەتی هەر جارێك و دوان کاروو بار لە جێی ی کە سێکی تر مەیسەر دەکرێت سەرەنجام کارەکە وەك خۆی دەمێنێتەوە و تەنها کەسەکە خۆیشی زەرەر مەند دەبێت هەربۆیە ئەم پەندە دەڵێت ( ئەوەی بەنیازی ماڵی تر بێت ئەوا بەبرسیەتی سەردە نێتەوە).

## ﴿ ئیش ئیمڕوو مەخەرە سوبزی ﴾

کاتی خۆی جوتیارێك لەکاتی پێگەیشتنی بێستانەکەی دەیە ویت لەگەڵ ماڵ و منداڵەکەی بێستانەکە بڕنن و بینێرن بۆشار، ئەو ڕۆژە خۆی لەدڵی خۆیدا دەڵێ : دەی سبەی بێستانەکە دەڕنین، کاتێك باوکی جوتیارەکە دەچێتە ناو بێستانەکە دەڕوانێت زۆربەی بەرهەمەکە ڕزیوە ئینجا بەکوڕەکەی دەڵێ: ئیشی ئەمڕۆ مەخەرە سبەینێ. هەڵبەتە ئەم پەندە بەسەر تەواوی کارو باری ژیانی ئێستاش هەردەگونجێت و فێرمان دەکات هەرکارێك ئەگەر ئەمڕۆجێ بەجێ ی بکەین زۆر باشتر دەبێت لە سبەینێ.

## ﴿ خزم خەراپ وەك گوون قۆڕە بڕمەی بەی مرم نیّ بڕمەی تەکەی دیاك﴾

لێکدانەوەو شیکردنەوەی ئەم پەندە بەنرخەو پڕواتایە مەبەست ئەوەیە کە مرۆڤ هەرچەندی چاك بێت لەناو کۆمەڵگادا ڕێزێکی تایبەتی هەبێت خاوەنی کەسایەتیەکی تایبەتی بێت، بەڵام کەخزمێکی خراپی هەبوو بوە مایەی کێشە بۆ خۆیو کۆمەڵگا ئەوا ئەو کەسەش هەست بەوە دەکات بەو خزمە خراپەیەوە توشی کێشە دەبێت بنەماڵە کەیشی گیرۆدەدەبن پێیەوە بۆیە وتراوە خزم خراپ وەك گونی قۆڕ وایە، چونکە گونی قۆڕزۆر بە ئازارە و عەیب دارە دایم خاوەنەکەی هەست بە عەیب داریەك دەکات لەناو خەڵکدا ئەگەر بیبڕێت پێی دەمرێت، چونکە گوون یەکێکە لە ئەندامەسەرەکیەکانی لەشی مرۆڤ ئەگەر نایشی بڕێت تەکەی دێت لەکاتی ڕۆیشتندا وەلەناو مەجلیس وباندابۆیە ئەو خزمە خراپەش بەو شوبهێنراوە.

# ﴿ بەدەرزن بالەخوەت ئنجا بەگندووژ بالەخەڵك ﴾

دەربەندیەکان بەدەرزی دەڵێن( دەرزن) و بە(شوژن) یش دەڵێن ( گندوژ) هەردووکیشی بۆکاری درومان بەکار دێت، بەڵام دەرزی بۆدوورینەوەی جل و بەرگ و شوژنیش بۆدورینەوەی جواڵ و گونیە و بەڕە و تیڕ بەکار دێت، ئەم پەندە دەرزی و شوژنی کردۆتە ڕەمزی ویژدانی مرۆڤ و ئاگادارمان دەکاتەوە هەرکا تێك ویستمان زیانێکی گەورە ( بە بێ هۆ) بە یەکێك بگە یەنین بەرلەوە زیا نێکی بچوك بە خۆمان بگە یەنین تاهەست بکەین لێدانی زیان لەخەڵك چەندە بە ئازارو ناخۆشە، کاتێك خۆمان هەستمان کرد زیانمان کردوە و ئازارمان پێ گەیشتوە ئەو سا دەست بۆ زیان گەیاندن و ئازار گەیاندن بۆخەڵکی تر درێژ ناکەین.

# ﴿دەرزن لەچەو خەڵك دووینیك بەس گوندوژلەچەو خوەی نیّ وینیك﴾

هەموو مرۆڤێك لەژیاند توشی هەڵەو کەموو کوڕی و ناتەواوی دەبێت، بەڵام ئەوەگرنگە زوو درك بە هەڵەکەی خۆی بکات و هەمان هەڵە دووبارەش نەکاتەوە، ئەم پەندە زیاتر ئاراستەی ئەو کەسانەیە کە خۆیان خاوەنی هەڵەوکەمووکوڕی زۆر گەورەن بەڵام هەڵەو کەموو کوڕی خۆیان نابینن لە هەمان کاتدا هەڵەیەکی بچوکی خەڵکی تر بەباشی دە بینن و قسە یشی لەسەردەکەن، بۆیە ئەم پەندە پێمان دەڵێت بەرلەوەی هەڵەی کەس ببینی هەڵەی خۆت ببینەو هەوڵ دە چاکی بکە.

# ﴿مەمك دایك خۆگەزە﴾

مرۆڤە ژیرەکانی سەردەمانی زوو ئەو کەسانەیان ناسیوەو دەستنیشانیان کردوە کەبێ گوێ دانە هیچ بە هایەك و بێ گوێ دانە ڕادەی خزمایەتی و دۆستایەتی و مرۆڤ دۆستی کەی دەستیان بڕوات زیان بەو کەسانە دەگەیەنن کەلە دڵ و دەروونی ئەو جۆرە کەسە جێ ی نا بێتەوە، بە واتایەکی تر لە ناو کۆمەڵگەدا کەسانێك هەن بێ سڵمینەوە لە بۆسەدان بۆ زیان گەیاندن بە هەموو کەسێك تەنانەت بە براو خزم و هاوڕێشیان بێت بەو مەرجەی ئەو زیان گەیاندنە کەمێك لە قازانجی خۆیان بێت.

# ﴿خێر بەخوێش نەك بەدەروێش﴾

لێکدانەوەو شیکردنەوەی ئەم پەندە جوانە مەبەست ئەوەیە کە مرۆڤ ئەگەر خێربکات یان چاکەیەك بکات لەگەڵ کەسە نزیکەکانی خۆی بیکات باشترە لەوەی بیداتە دەروێشێك کە قەت نەیدی بێ و نەی ناسێت، ئەم پەندە چەند لێکدانەوەیەکی بۆکراوە بەڵام ئەوەی زیاترگونجاوە ئەوەیە ئەگەر شتێکت کردە خێر لەماڵی خۆت هەوڵ بدە بیدەیتە خزموو کەسەکانی خۆت یان جیران و هاو سێکانی خۆت بەمەرجێك هەژاربن و خێریان پێ بشێت، چونکە ئاینی ئیسلامیش جەختی لەوە کردۆتەوە کەوا خێر بیدەیتە خزم و جیرانەکانی خۆت گەورەترو باشترە لەوەی بیدەیتەکە سێکی دوور بۆئەوەی بەس پێت بڵێن کابرا خێری کردوە.

# ﴿خۆسەردان قەبرسان نەکردییت﴾

لێکدانەوەو شیکردنەوەی ئەم پەندە جوانە واتای ئەوەیە کاتیك بچیتە ماڵێك لەدوای سەلام کردن و هەواڵ پرسین خاوەنی ماڵ فەرو دەکات بابچین لەژورەوە دابنیشین چایەك قاوەیەك بخۆین، بەلاّم میوانەکە دەڵێت بەخوا هیچ لیێ نا نێن لەولاّمدا خاوەن ماڵەکە خانە خویێ یەکە دەڵێت خۆ سەردان قەبرسان نەکردییت ئەمە بەو واتایە دێت کەوا لەکاتی سەردانی کردنی قەبرساندا هیچ شتێك لە گۆڕستان وەرناگریت تەنیا وەك فەرامۆشیەك بۆدڵت سەردانی دەکەیت.

# ﴿حساب ڕاساڵ سەختە شایەت ڕاپیاو چەفتە﴾

شیکردنەوەو لێکدانەوەی ئەم پەندە جوانە، واتا حساب ڕاگرتن لەنێوان وەرزەکاندا بۆساڵێکی سەختە کەئەو ساڵە باراناوی بێت یان ساڵێکی وشکە ساڵی بێت کەلەلایەن پیاوەدنیا دیدەو بەتەمەنەکانەوە پێش بینی دەکراو حسابی خۆیان ڕادەگرت بەحسابی نەورۆز یان گەلاوێژ هەڵاتن، بەڵام شایەتی دان بۆپیاوی خراپ کارێکی باش نیە، واتای ئەوەیە کەپیاوێکی لابەلاو بێ وەعد و درۆزن هەرکاتێك لەگەڵیا مامەڵەیەك بکەیت لازمە بەشایەدیو بەئاشکرابیکەی چونکە لە هەموو کاتێکدا جێگای گومانە بۆیە پێشینان بەم وتە جوانە ئەم دوو شتەیان بەراورد کردووە.

# ﴿پڕزکم قسەست بەس سەرزمانم بڤەست﴾

لێکدانەوەی ئەم پەندە بەنرخە واتای ئەوەیە کەلەناخمدا زۆر قسەم پێیە دەری ببڕم کەلەناخەوەپەنگی خواردوە بەڵام ناتوانم دەری ببڕم ، چونکە قسەی حەق هەندێك ناخۆشە وتنی چونکە زۆر کەس دڵگران دەبن بەتایبەت ئەوانەی کە کارو کردەوەکانیان نابەجێن لە حەق دەترسن، بۆیەش وتراوە سەرزمانم بڤەست، واتا لەزمانی خۆم دەترسێم بیدرکێنم بەڵایەکم بۆدروست بێت، چونکە پێشینان وتویانە ﴿ زمان بەڵای سەرە﴾ واتا زۆر بەی کێشەکانی توشی مرۆڤ دەبن لەسەر زمان و جۆری قسە کردنە.

# ﴿ ڕیوی خوەی نێچی بەکوناوە
# هەژکیك بەستابی بەکلکیەوە ﴾

لێکدانەوەو شیکردنەوەی ئەم پەندە جوانە بەچەند واتایەك هاتوە لەکوردەواریدا بۆهەرناو چەیەك و گوندێك بە مانایەکی تایبەتی هاتوە بەڵا بە شێوەیەکی گشتی واتای ئەوەدەگەیە نێت کە کەسێك بۆخۆی بەحاڵە حاڵ لە شوێنێك جێگای بۆبکەنەوە یان ئیشێکی بۆبکەن، ئەوا هەستێت کەسێکی ترلەگەڵ خۆیدا ببات بۆئەو شوێنە، یان خۆی ئەوەندە خۆشەویست نەبێت لەلای بنەماڵەیەك بەخاتر گرتن ببەنە شوێنێك یان میوان داریەك کەچی ئەو کە سێکی نامۆ یان کەسێکی نەشیاو لەگەڵ خۆیدا ببات بۆ میوانداریەکە بۆیە لە کوردەواریدا ئەم ووشە جوانانەی پێ وتراوە.

## ﴿کیسەی بەتاڵ ڕاست نێ وستیک﴾

واتاو لێکدانەوەی ئەم پەندە جوانە مەبەست ئەوەیە کە ئەگەر کیسەیەك هیچی تیانەبێت قەت ڕاست ڕاناوەستێت، ئەگەر پیاوێك تەواو کامڵ نەبێت هەر فێڵی لێ دەکرێت، ئەگەر پیاوەکە سەرکردەش بێت یان کەسێکی ئاسایی ئەگەر کەسێکی تەواوبەتوانا نەبێت ئەوا لە ئیشێکدا هەرلار دەبێت بەجوانی نایکات یان لەکارێکدا هەڵەیەك هەردەکات.

## ﴿گای پیرو هەوسار سوێر نەوەتیون﴾

شیکردنەوەو لێکدانەوەی ئەم پەندە جوانە، مەبەست ئەوەیەکەپیاوێکی پیرو سەرو ڕیش سپی بەڵام عەقڵی منداڵانەو دایم هەر خەریکی سەر ڕەش کردنەوەو خۆڕیك خستن بێت لەجیاتی ئەوەی پیاوی کۆڕودانیشتنەکان بێت، ئەم جۆرە پیاوە لەکوردەواری خۆمان بەئێستاشەوە زۆرن بۆیە بەم وتە جوانە ئاماژەیان بۆکردوون، چونکە گایەکی پیر پێویستی بەوە نیە هەوساری سوری بۆبکەی تازە.

# ﴿ کردەی پەشیمان بی نەك نەکردەی پەشیمان﴾

واتاو شیکردنەوەی ئەم پەندە جوانە مەبەست ئەوەیە کەکارێك هاتە پێشت بیکەیت باشترە لەوەی گوێی پێنەدەیت و بەهەند وەری بگریت ، بەڵام دوای تیّ پەڕبونی ماوەیەك پەشیمان بیتەوەو بڵێیت خۆزگە ئەنجامم ئەدا، ئەگەر ئەو کارەی هاتەپێشت حەزیشت لیّ نیە ئەنجامی بدەیت هەوڵ بدە هەر بیکەیت، چونکە ئەگەر لەکاتی خۆیدا ئەنجامی نەدەیت دواتر پەشیمانی هیچ سودێکی نیە، هەربۆیە لەکوردەواریدا بەم پەندە جوانە گوزارشتی لیّکراوە.

# ﴿لەهەمووخەزانیك هەس كوە﴾

واتاو شیكردنەوەی ئەم پەندە جوانە مەبەست ئەو كەسانەیە كە لەهەمووئیشێك خۆیان هەڵ دەقورتێنن بەبێ ئەوەی كەس پرسیان پێ بكات ، ئەوجۆرەكەسانە حەزیان بەوەیە لەهەمووكێشەو گرفتێك وڕووداوێك بەژدار بن و قسەی خۆیان هەبێت بۆیەش بەم شێوەیە پێیان وتراوەلەلایەن پیاوە بەتەمەنەكانەوە، چونكە ئەگەرسەیربكەین (هەسكو) ئەوشتەیە كەبەدەستی كابانەوەیە لەزمانی سۆرانی پێی دەڵێن كەوگیر كابان دەی كات بەهەموو مەنجەڵێكدا بۆئەوەی خواردن یان شیوی پێ تێبكات .

# ﴿وەك هەوجارِ زبارەست﴾

واتاو شیکردنەوەی ئەم پەندە جوانە بەو کەسانە وتراوە کەوا هەر ڕۆژەو لە ئیشی کەسێکن ئینجا بەزبارە بێت یان بەتەنیایی ئەو جۆرە کەسانە لە بەر ئیشی خەڵك ئاگایان لە ئیشەکانی خۆیان نەماوە، بۆیەش پێشینان بەم شێوەیە بەراوردیان کرددوە، چونکە هەو جارِی زبارە دایم لە ئیشی خەڵك بوو ئەو دەی برد بەیانی سرەی ئەمی تربوو کابرای خاوەن هەوجارِ بەر خۆی نەدەکەوتەوە تا کارەکەی خۆی بەهەوجارِەکەبکات.

## ﴿جیك ئاگر لەی نەسوتیك
## دویكەڵ لەی هەڵ نیَ ڵستیك﴾

واتای ئەم پەندە جوانە ئەگەر کەسێك یان لایەنێکی سیاسی یان بنەماڵەیەك ئەگەر جێگای گومان نەبن ئەوا چۆن خەڵك لەخۆیانەوە زەندی خراپیان بۆدەبەن، دیارە ئەو بنەماڵەیە یان ئەو کەس و لایەنە ئەو جۆرە کارەیان لیَ دەوەشێتەوە بۆیە بەو جۆرە باسیان دەکرێت، چونکە خۆمان باش دەزانین ئەگەر ئاگر لە شوێنێك بسو تێت دوکەڵی لیَ هەڵدەستێت.

﴿ عەمەل کەرت بمریك تەکبیر کەرت نەمریك﴾

ئەم پەندە ئەو ڕاستیەمان بۆ ئاشکرا دەکات کەلە وڵات و تەنانەت لە ناو خێزا نێکیش زیانی مردنی کەسی ژیرو تەگبیر چی و ئەوەی پلان و بەرنامەی ڕۆژانە دادە ڕێژێ و پیاوێکی ژیرو دانایە زۆرگەورەترە لەمردنی ئەوکەسەی کەئەرکی بە خێوکردنی ماڵێکی لە ئەستۆ دایە واتە مردنی کەسێکی ژیر و خاوەن تەگبیر شوێنە واری مردنەکەی زۆر گەورەترو کاریگەرترە لەمردنی ئەو کەسەی بە خێوکردنی خێزانێکی لەئەستۆیە.

﴿ دەست گەلە لەناو ئیشتا بووك

بەس لەناو خواردنتا نەبووك﴾

ئەم پەندە ئامۆژ گاریمان دەکات بەوەی لە کاروباری جوتیاری و کاری ڕۆژانەی خۆمان پەنا بۆ هەرەوەزی ببەین ، چونکە دەستی هەرەوەزی هەمیشە کارەکان باشتر ڕادە پەڕێنێت و لەکاتی خۆیدا تەواو دەبن و سود دەگەیەنن ، باپیرانمان ووشەی (گەلە) یان کردۆتە واتای هەرەوەزی و بۆئەوەی بایەخی پەندەکەمان لازیاتر بکەن گوتویانە هەرەوەزی تەنها لەنان خواردن نە بێت ئەگینا لە هەموو کارێك سەرکەوتو دە بێت.

## ﴿ سەگ سفرە هەر بەخاوەند خوەی حەپیك﴾

دە شێت ئەم پەندە واتاکەی بۆ ئەندامانی خێزانێك یان خێڵێك یان گوندو شارێك یان نەتەوەیەکیش بگونجێنین، ئەم پەندە (سەگ) ی کردۆتە ڕەمزی ئەو کەسانەی ڕەفتاریان خراپەو هەموو خراپەکەشیان بۆخزم و کەس و کارو نەتەوەی خۆیانە نەك خەڵکی تر، لەکوردەواریدا سفرە بەو کەسانە گوتراوە کە منەتیان بەو چاکە یە نیە کەلە گەڵیان دەکرێت پەندەکەش واتای کەسی بێ وەفا سفرە (سپڵە)ی کردۆتە نمونەی خراپی کۆمەڵگا.

## ﴿ خوارزای خوێڕی هەر بەخارووی خوەی دوویریك﴾

لەکۆمەڵگای کوردیدا بە هۆی بەتینی پەیوەندیە کۆمەڵایە تیەکانەوە خاڵ و خوارزا لای یەکتر خۆشە ویست بوون و پەیوەندیان بە هێزبوە ، بەڵام هەندێك کەس لەم ڕێساکۆمەڵایە تیە دەردەچن و دەبن بە کەسێکی خراپ، ئەم پەندەش ئاراستەی ئەو خوارزایانەکراوە کە بەکەسی تر ناوێرن و گێچەڵ تەنها بە خاڵی خۆیان دەکەن ئەویش لەبەرئەوەیە خاڵ هەمیشە لەبەر خاتری خوشکەکەی دەستی نا چێتە خوارزاکەی هەربۆیە بەو جۆرە خوارزایانەگوتراوە خوارزای خراپ.

# ﴿هەرچەند ڕیسمەی هەر دبوو کەوە خوری﴾

واتاو شیکردنەوەی ئەم پەندە بەنرخو جوانە مەبەست ئەو کەسانەیە کە زۆربەی کات لەقسەو واتاکەی تێناگەن بۆیە کەسی بەرامبەر ئەگەر قسەیان بۆبکات لەبەرامبەردا ئەو کەسەی واقسەی بۆدەکرێت تێنەگات یان گوێی پێنەدات ئەوا پێی دەڵێن هەرچەندی ڕیسمەی هەردبووکەوە خوری واتا من چەندی ئامۆژگاری تۆدەکەم بەڵام تۆلە گوێی ناگریت، بەمانایەکی تریش دێت کەسێك هەر خەریکی چاك کردنی کێشەو گرفت و کاروباری بنەماڵەیەك بێت ، بەڵام یەکێك لەو بنەماڵەیە ئیشەکە ئاڵۆز تربکات و هەرخەریکی نانەوەی کێشە بێت، ئەوش پێی دەڵێن هەرچەندی ڕیسمەی هەردبووکەوە خوری.

# ﴿کەرباری برنەو بوك هەرگورگ خوەیکەی﴾

مێژووی هۆنینەوەی ئەم پەندە بۆ ناوەڕاستی سەدەی بیست دەگەڕێتەوەو پیاوە ژیرو داناکانی دەربەندی بەم پەندە گوزارشت لەو کەسانە دەکەن کەلە ناو کۆمەڵگا ئەگەر هەرپلەو بەرپرسیارێتیەکیان بخەیتە ئەستۆ بەهۆی نەفامیانەوە ناتوانن بەئەرکی سەرشانی خۆیان هەستن و خزمەتی گوند و ناوچەو وڵاتی خۆیان بکەن، لەم پەندە چەکی برنەو بەپلە و بەر پرسیاریەتیەکە چوێنراوەو کەرەکەش بەو خەڵکانە چوێنراوە کە ژیرو دانا نین لە بەکار هێنانی هەر پلەو پۆستێك کە پێیان دەدرێت.

# ﴿ پشت بای بەبەردەوە
# نەك پشت بای بەنامەردەوە﴾

لەکوردەواریدا نامەرد بەو کەسانە گوتراوە کە هەمیشە لە یەکلا کردنەوەی هەرکێشەو گرفتێك ڕوو بەڕوو ڕەفتارناکەن و بەڵکو پەنا دەبەن بۆ زیان گەیاندن لەکاتی خافڵیداو لەپشتەوە خەنجەری ژەهراوی خۆیان لە جێگەی کاریگەر دەوەشێنن، بۆیە ئەم پەندە ئامۆژگاریمان دەکات و پێمان دەڵێت هیچ کاتێك تەنانەت لە کاتی لێقەو مانیشدا هانا بۆ خەڵکی نامەرد مەبەو پشتی پێ مەبەستە ، چونکە هەرکاتێك بەدڵی ئەو نە جولاّیتەوە لەدواوە زیانت پێ دەگە یەنێت.

## ﴿نە كوراو بكە بەڕەز نەناكەس بكە بەكەس﴾

لە شێوەزاری دەربەندیەكاندا ( كوراو) واتای شوێنێك دەگە یە نێت كە ئاوێكی كەمی هەیەو پێی دەڵێن كوێراو كەتوانای دابین كردنی ئاوی تەواوی نە بێت بۆ ئاودانی ڕەزوو باخێك، لەم پەندەدا كەسی ناكەس وەك كوێراو لێكدراوەتەوە واتە پشتی پێ نابە سترێت لەكاتی تەنگانەدا بە تایبەتی ئەو كاتەی كە كەسێك كاری دەكەوێتە لای ناكەسێك هەربۆیە پەندەكە ئامۆژگاریمان دەكات و دەڵێت ناكەس لە خۆتان مەكەن بەكەس.

## ﴿ئەگەردار لاربووك سێبەرەكەیشی لاردبووك ﴾

لەناو كرمەڵگادا زۆر كەسمان دیوە كە سێكی خراپ و شەڕانگێزو دەست و دەم پیس بوەو لای خەڵك خۆشەویست نەبوە لەهەمان كاتدا كچەكەی یان كوڕەكەی هەڵگری هەمان خاسیەت و سیفاتی باوكی بوون جا پەندەكە بەو جۆرە كەسانە دەڵێت( ئەگەر دار لار بێت سێبەرەكەشی لار دەبێت.

# ﴿ هەمووشت لەباریکی پسیك
# بەس زوڵم لەئەستویری پسیك﴾

واتاو شیکردنەوەی ئەم پەندە ئەوەیە هەموو شتێك تا تەنك نەبێت یان تەواو باریك نەبێتەوە ناپسێت نابێت بەدوو کەرتەوە وەك ئەو پەندەی دەڵێت بەرە لەلای نەکیەوە دەدرێت، بەڵام بە پێچەوانەوە مێرد واتا پیاو لەکاتی بە قوەتی و هێز ئەو کاتەی بە قووەتە هەموو ئیشێك دەکات حساب بۆخۆی ناکات کەوا ئیشێك نەکات زەربە بەلەشی بگەیە نێت، ئەو کاتە مەترسی هەیە کەوا بپسێت ،چونکە زۆر کردن لە خۆت لەئیشدا کاری گەری خراپی هەیە لسەر لەشی مرۆڤ، بەواتایەکی تر زۆر حکومەت و دیکتاتۆرمان بینی لەکاتی بەهێزیی و هەرەتی مەغرور بونی سەرکردەکان دەوڵەتەکەیان لە ناوچوە ئەوەندە زاڵم و زۆرداربوونە بەرامبەر میلە تەکەیان خەڵکیش لێیان هەستاوەوەك (سەدام حسین، حوسنی موبارەك، زینل عابدین، بەشار ئەسەد، مو

عەمەر قەزافی)و چەندانی تر.

## ﴿ بەرگ نێکەیکەت دووان
## بەس کەیکەت یەکیك لەناو هەوان﴾

ئەم پەندە بەو کەسانە گوتراوە کە زۆربەی کات لە کۆڕو دانیشتن و دیوەخاندان و گەورەیی و ڕیش سپێتی کۆمەڵە خەڵکێك دەکەن و خەرکی چارەسەکردنی کێشەی کۆمەڵایەتین، جا پەندەکە بەو کەسانە دەڵێن لەو کاتانەدا پێویستە جل و بەرگتان ڕێك و پۆشتە بێت نەك شێوەیەکی ناڕێك، هەربۆیە پەندەکە دەڵێت ( بەرگ ناتکات بەدووان بەڵام دەتکات بە یەکێك لە ناو هەمووان)

## ﴿پارێزی لەدەست شکیاو بکە﴾

با پیرانمان بەهۆی ئەزموونی زۆریانەوە زانیویانە کەزۆر نەخۆشی هەن لە مرۆڤێکەوە دەگوازرێتەوە بۆ مرۆڤێکی تر هەربۆیە بۆئەوەی خەڵك دوور بێت لە توش بوون بەنەخۆشی و خۆپاراستن و خۆتەریك گرتن لە نەخۆشیە کوشندەکان لایان ئاسایی بێت نەك شەرم و عەیبە بێت لایان گوتویانە ( پارێزی لەدەستی شکاو بکە).

# ﴿ داریك بەری ڕام نەبوك سیٚ بەریشی نیٚ بوك ﴾

لێكدانەوەو شیكردنەوەی ئەم پەندە جوانە بەچەند مانایەك دێت بۆهەركەسێك یان بنەماڵەیەك بەگوێرەی ڕوداوەكان لێكدانەوەی بۆدەكەن و بۆكراوە، بەڵام زیاتر ئەم پەندە لەلای ئەو ژنانە دەبیسترێت كە پیاوەكانیان ژنی دووەمی بەسەر هاێناون ژنی یەكەم بەمناڵەوە پیاوەكە بەرەڵای كردوون ماڵ وێران بوونە ئەگەر كەسێك لە هەواڵیان بپرسێت وبڵێت پیاوەكەت چۆنە لەگەڵتاندا لەوەڵامدا دەڵێت دە بێت جۆن بێت دارێك بەری بۆمن نەبێت سیٚ بەرەكەیشیم ناوێت.

# ﴿سێبەر بن دیواریان خوەش بیە﴾

لە کۆمەڵگای لادێ نشینی کوردەواریدا بەکەسانێك دەگوترا (سێبەری ژێر دیواریان خۆش بوە) کەتازە کچی عازەب بوایە، سێبەر خۆش بوونەکەش لەوەوە هاتوە کە هەر خێزا نێك کچی پێگە یشتوی هەبوایە دەبوونە جێ ی سەرنجی گەنجان تابیر لەوە بکەنەوە بچنە خواز بێنی و بیانکەن بەخزم.

## ئەمانەش کۆمەڵێک پەندو وتەی بەنرخی ترن

## به شێوەزاری دەربەندیەکان

﴿دیوم پیاو هەموو فەسڵێك بووینیك
بەس هەموو مرازیك نێوینیك﴾

﴿ بێ پێڵاوی باشترە لە پێڵاویك تەنگ
بێ ماڵی باشترە لە ماڵێك پڕدەنگ﴾

﴿بولبولیك فێردارستان و لێڕ بووك
قەفەس پیری کەیك باشوی لەژێر بووك﴾

﴿ سەگ لە قەساب خانە گەورە نەبوك
عومری بەخەسار ڕوەیشتیە﴾

﴿وەویك هاوردین پایی بەدەشتەوە
کویکەی بەگیلان دنیای ڕشتەوە﴾

﴿ ئەگەر تەشی ڕیس تەشی ڕیس بوك
بەکللك کەریش بوك تەشی خوەی ڕیسیك﴾

﴿ تاوستان هان لە سێبەر پەڵك ،
زمستان بەجوارەوە دیانەسەرچاڵ خەڵك﴾

﴿ خزم خوەت ئەگەر گوشتیشت بخوەیك
هێسکت نیٚ شکنیك﴾

﴿ئەوەی ڕا گوی کەر هەڵ کەفیك
ڕا ڕاوکەر هەڵ نێکەفیك﴾

﴿دنیا گەڕ دەسروك نیە
هەر ڕوژی لەسەریەکیك بووك﴾

﴿ ئالیك کەر دەیك بەی
بارهەسترلەی بارکەیك﴾

﴿نان سەگ دەیك بەی
راوتانجی بەی کەیك﴾
﴿ دوێت وەك سەرین گورانە
لەخوەیەوە گەورەدبوك﴾
﴿ ماران گەستە لە گوریس
سێ و بازی رەویکەوە﴾
﴿ ئەی دنیا هەوەسیکە
هەررۆژەی بەدەست تەرەسیکە﴾
﴿کوێخای ماڵم کورە
گیسك ساڵم دووجاربرە﴾
﴿ئەگەردۆست وەك توم هەبووك
دووژمن راچوێمە﴾
﴿خۆ واران پەرەنیم هەمووسەریك بگرم﴾
﴿هەسپ و هەستر بەشەردیاك

﴾کەرو گا لەبن دەست و پاچوك﴾

﴾وەویك هاوردین سەربەلەرزانە

تیکەلەدەمیا پالەکولانە﴾

﴾ میوان ناوەخت نانی هالە سەرخوەی﴾

﴾ لەوەرناچاری بەدۆست دایەم دویشم بابە﴾

﴾ کەس بەدووی خوەی نیَ ویشیك تورش﴾

﴾بەدویای کەلاو وابردی مەکەف﴾

﴾دوێتم پشت سەرت چەو بووك﴾

﴾کاسە هەم سابردم لەحەرەتی مردم﴾

﴾سیرخوەت بای لە سمیڵ خوەت﴾

﴾هەرگولیك بویك هەرئادەمیك خویك﴾

﴾بەفویك گەرم وبەفویکیش ساردە﴾

﴾چوارپایان سەگە سەگیشیان نیە﴾

﴾ئەڕابڵند فڕی بەس بەنەویاکەفت﴾

﴿تەیر گول عاشق بەدار ژەقنە بووتە﴾

﴿دەم خوەیك چەو شەرم کەیك﴾

﴿مردی خەڵك بەخەڵك

خەولەی کەفتیە﴾

﴿ خۆ کوزەرگەنم نیت

هەربکوتمەوەت لەت پەیدابوك﴾

﴿ ڕیوی گەڕووك باشترە لەشێر خەفتی﴾

﴿ بزن ڕا یەك شەو جی خوەی خوەش کەیك﴾

﴿ئاوبڕیك لەڕۆخانە خزم چاکترە لە بێگانە﴾

﴿نەکوندە بکە بەبوست نەدووژمن بکە بەدۆست﴾

﴿مێوان لەخانەخویَ ڕابوینیك

تیکەی گەورە پیچیکەوە﴾

﴿مێوان ڕکی لەمێوان دبوکەوە

خانەخوێش لەهەردوکیان﴾

﴿گوی وشك نێ نویسیك بەقوین كەسەوە﴾

﴿بەكەروەتن تاكورە دڕوێی وەت نەقیزە زانیك﴾

﴿دویشێ بناوان سوێركن﴾

﴿ چوێ بچێنی ئەوەش دویر نیەوە﴾

﴿ پێش واران كەپەنەك ﴾

﴿ عەلانیش بەكیر منداڵی میزیك﴾

﴿هەردەستیك شەرع بڕیكەی خوینی نیە﴾

﴿گووم تاقویل بووك مەلەوانی خوەشە﴾

﴿مێوان شەویك جاسویس سەدساڵە﴾

﴿تیر هاویژیك كەوان كیشیكەوە﴾

﴿ جوێ بەدیوارا بەیكە خوار﴾

﴿كەنگرو ماست بەوەخت خوەی﴾

﴿ كل لەچەو ڕفنیك﴾

﴿ مانگا مردوو دوو بڕیا﴾

﴿بەڕە لەتەنکیەوە دڕیك﴾
﴿دیانت چەرمووۆ نەبووك﴾
﴿شەیتان شەرم لەی کەیك﴾
﴿وەر ئاوێنەی پشت مەقەس﴾
﴿کفرو کاریتە نەوەتیوون﴾

﴿ژنیك واتم ژنانە پوستە بکەیکە همانە﴾
﴿سێ بات داربی خوەشە ئەگەرمارلەی نەبووك﴾
﴿باخەڵ گەورەدوێت خوەشە ئەگەر یاری نەبووك﴾
﴿میمکە لومەی من دکرد بەخوەی وشکە ڕن دکرد﴾
﴿تیڕو شیرن بەیەکەوە چانێ بوك ئیلا چایە نەبووك﴾
﴿جاریك فێڵ لەم کردیت خوا بگریکەت
جاردووەم فێڵ لەمکردیت خوابگریکەت
جار سێ یەم فێڵ لەم کردیت خوا خوم بگریك﴾

**لیستی سەرچاوەکان:**

١- د.شوکریە ڕەسوڵ: ئەدەبی کوردی و هونەرەکانی ئەدەب ، ساڵی چاپ ١٩٨٩.
٢- کەریم شارەزا: پەندی پێشینان لە شعری کوردیدا، لە چاپکراوەکانی کۆڕی زانیاری کورد، بەغداد ١٩٧٦.
٣- د. عزەدین مستفا ڕەسوڵ : لێکۆڵینەوەی ئەدەبی فۆلکلۆری کوردی، چاپی دووەم ، بغداد،١٩٧٩.
٤-علا ئدین سجادی: دەقەکانی ئەدەبی کوردی ، لە چاپکراوەکانی کۆری زانیاری کورد، بەغدا، ١٩٧٩.
٥- عومەر شێخەڵا دەشتەکی: پەندی کوردی ، چاپی یەکەم، چاپخانەی کوردستان ، هەولیر ،١٩٧٢.
٦- شێخ محمد خاڵ: پەندی پێشینان ، چاپی سێ یەم، چاپخانەو پەخشی سەردەم، سلیمانی ، ٢٠٠٠.
٧- حەمید گەردی : سامان و پەندی گەردی، چاپی دووەم، هەولیر،٢٠٠٦.
٨-کەریم شارەزا : پەندی بەراورد کاری، چاپخانەی سەمیر امیس،بەغدا، ١٩٨٣.

٩-د. عیـــزەدین مســـتەفا ڕەســـول: لێکۆڵینـــەوەی ئـــەدەبی فۆلکلـۆر ، چـاپخانەی زانکـۆی سـلێمانی، چـاپی دووەم، سـلێمانی ، ١٩٧٦.

١٠-زمـــان وئـــەدەبی کـــوردی : پـــۆلی ســـێیەمی ناوەنـــدی ، بەڕێوەبەرایەتی پرۆگرامەکان، چاپی دوەم ، ٢٠٠٨.

١١-د. شـوکریە ڕەسـول : ئـەدەبی فۆلکلـۆری کـوردی، چـاپی یەکەم ، دەزگای مویزیك، هەولێر، ٢٠٠٨، ٦٧,٤

١٢- د.موحســین ئەحمــەد عومــەر: فەرهــەنگی زاراوەی ئــەدەبی ، چاپی یەکەم، لە بلاوکراوەکانی ئاراس، هەولیر، ٢٠٠٥.

١٣-نـەجم خالیـد ئـەڵوەنی : پەنـدو قسـەی نەسـتەقی کـوردی شاری خانەقین، چاپخانەی موکریان، هەولیرن ٢٠٠٨.

١٤- جـــەمال بابـــان: قســـە هـــەزارە دوانـــی بـــەکارە، لێکۆڵینەوەیـەکی پەنـدی پێشـینان، دەفتـەری کوردەوارە،بـەرگی یەکەم، بەغدا، ١٩٧٠.

## گۆڤارو ڕۆژنامەکان

١- نوخشە محمد ابراهیم: بیری ناپەسند لەپەندی پێشینانی کوردیدا، گۆڤاری سابات، ژمارە (٤،٥)،سلیمانی نەورۆزی ٢٠٠٧.

## دەستنوس و لێکۆڵینەوە بڵاو نەکراوەکان .

١- دەرباز جەوهەر- دەشتی حەمەدەمین: هەندێك لەپەندی پێشینان بە شێوەزاری ناوچەی سێگردکان و ئومەرگومەت، لێکۆڵینەوەیەکی دەرچونی بلاونەکراوە، سالّی ٢٠٠٩ز، زانکۆی کۆیە.

٢- عبدالرحمن عمر: پەندی پێشینانی لوڕی، لێکۆڵینەوەیەکی دەرچونی بلاّونەکراوە، سالّی ٢٠١٢ز،زانکۆی سۆران.

٣- هەڵمەت حەمەدأمین: ڕاناوکەسییە سەربەخۆکان لە شێوەزاری لوڕی، لێکۆڵینەوەیەکی دەرچونی بلاّونەکراوە، سالّی ٢٠٠٨ز، زانکۆی کۆیە.

**چاوپێکەوتنەکان:**

١- عومـــەر احمـــد علـــی: چـاوپێکەوتن، لەبـــەرواری ٢٠١٢/٦/١٠ سێگردکان، کات ژمێر٣ی پاش نیوەڕۆ.

٢- عبـــــــدولا محمـــــــد مولـــــــود: چـــــاو پێکـــــــەوتن لەبەرواری٢٠١٢/٦/١٢، تەق تەق، کات ژمێر ١٠ی بەیانی.

٣- حمـــد امـــین حمـــە مســـتفا: چـاو پێکـــەوتن ، لەبـــەرواری ٢٠١٢/٦/١٣تەق تەق، کاتژمێر ٩ی شەو.

٤- ڕەشـــــید حمـــــە عـــــەلی حـــاجی وسمـــان: چـــاوپێکەوتن( ٢٠١٢/٦/١٩) کەورگۆسك، کاتژمێر ١١ی نیوەڕۆ.

٥-عبدلباســـــت عمـــــر حمـــــە ڕەش: چـــاوپێکەوتن لەبـــەرواری ٢٠١٢/٨/١٠، تەق تەق، کات ژمێر١٠ی بەیانی.

٦-عســـمان حمـــد ا مـــین علـــی : چـــاو پێکـــەوتن لەبـــەرواری ٢٠١٢/٨/١٣ تەق تەق، کات ژمێر ٤ی پاش نیوەڕۆ.

٧- عومـــــەر عزیـــز حمـــدامین: چـــاو پێکـــەوتن ، لەبـــەرواری ٢٠١٢/١٠/١، تەق تەق، کات ژمێر ٨ ی شەو.

٨-أقبـــال ســـەفەری: چـاو پێکـــەوتن لەبـــەرواری ٢٠١٣/١٠/١٠، لەقەلعـــەی حزبـــی دیـــوکرات-کۆیـــە، کـــات ژمێـــر ٣ی دوای نیوەڕۆ.

٩-أبراهیم عبدالرحمن أبراهیم: چاوپێکەوتن لەبەرواری ١١/ ١٠/ ٢٠١٣، نومەرگومەت، کات ژمێر ٨ی شەو.

١٠- هەیبەت ابراهیم محمد: چاو پێکەوتن لەبەرواری ٢٠١٣/١٠/١٢، تەق تەق، کات ژمێر١٠ی بەیانی.

١١- سبری سمایل سالّح: چاو پێکەوتن لەبەرواری ٢٠١٣/١٠/١٣، تەق تەق، کات ژمێر ١٠ی بەیانی.

١٢- پەری عبدولاحەمە لاو: چاو پێکەوتن لەبەرواری٢٠١٣/١٠/١٣، تەق تەق، کات ژمێر ٩ی بەیانی.

١٣- نەسرین خدر حمەلاو: چاو پێکەوتن لەبەرواری ٢٠١٣/١٠/١٣، تەق تەق، کات ژمێر ١٠ی بەیانی.

١٤-محمد أحمد حمد أمین: چاو پێکەوتن لەبەرواری ٢٠١٣/١٠/١٣، تەق تەق، کات ژمێر ١٠ی بەیانی.

١٥- جومعە کانی لەلەیی: چاو پێکەوتن لەبەرواری١٤/ ١٠/ ٢٠١٣، تەق تەق، کات ژمێر ٨ی شەو

١٦- فتحی عبدالقادر محمد: چاو پێکەوتن لەبەرواری ١٥/ ١٠/ ٢٠١٣، تەق تەق، کات ژمێر ٨ی شەو.

١٧- همینــه حمــه مولــود: چــاو پێکــەوتن لەبــەرواری١٦/١٠/٢٠١٣، تــەق تــەق، كــات ژمێــر ١٠ی بەیانی.

١٨- همینــه محمــد أومــەر: چــاو پێكــەوتن لەبــەرواری ١٦/١٠/٢٠١٣، تەق تەق، كات ژمێر ٤ی پاش نیوەڕۆ.

١٩- عــزەم حســین رحمــان: چــاو پێكــەوتن لەوبــەرواری ١٧/١٠/٢٠١٣دیموكرات-كۆیە، كاتژمێر٣ی دوای نیوەڕۆ.

٢٠- جلیــل گــادانی: چــاو پێكــەوتن لەبەرواری١٧/١٠/٢٠١٣دیموكرات-كۆیە، كاتژمێر١٠بەیانی.

٢١. د.حســن قــادر زادە: چــاو پێكــەوتن لەبــەرواری ١١/١١/٢٠١٣دیموكرات-كۆیە، كاتژمێر٥ی دوای نیوەڕۆ.

٢٢- حكــیم عبــدالرحمن: چــاو پێكــەوتن لەبــەرواری ١٢/١١/٢٠١٣، تەق تەق، كات ژمێر ٤ی پاش نیوەڕۆ.

٢٣- زەینــەب جبــار كــریم: چــاو پێكــەوتن ، لەبــەرواری ١٥/١١/٢٠١٣، كەركوك ، كات ژمێر ٨ ی شەو.

٢٤- عبــدولا خــدرمولود: چــاو پێكــەوتن لەبــەرواری ٢/١/٢٠١٤، تەق تەق ، كات ژمێر ٣ی ئێوارە .

٢٥-حـــاجی مولودمحمـــد: چـــاو پێکـــەوتن لەبـــەرواری ٢٠١٤/١/٥،سێگردکان، کات ژمێر ٤ی ئێوارە.

٢٦- أحمـــد قـــادر ســـالح: چـــاو پێکـــەوتن لەبـــەرواری ٢٠١٤/١/٥،سێگردکان، کات ژمێر ٤ی ئێوارە.

٢٧- بکـــر عبـــدالرحمن حمـــد امـــین: چـــاو پێکـــەوتن لەبـــەرواری ٢٠١٤/١/١٢،تەق تەق، کات ژمێر٨ی شەو.

٢٨-محمـــد رِســـوڵ أومـــر: چـــاو پێکـــەوتن لەبـــەرواری ٢٠١٤/١/١٥،تەق تەق، کات ژمێر٨ی شەو.

٢٩-علـــی عبـــدولا علـــی : چـــاو پێکـــەوتن لەبـــەرواری ٢٠١٤/١/١٦،تەق تەق، کات ژمێر١٠بەیانی.

٣٠- لقمـــان تـــەها ئیلنجـــاغی: چـــاو پێکـــەوتن لەبـــەرواری ٢٠١٤/١/١٦،تەق تەق، کات ژمێر١٠بەیانی.

٣١- أحمـــد عبـــدالرحمن حمـــد: چـــاو پێکـــەوتن لەبـــەرواری ٢٠١٤/١/١٦،تەق تەق، کات ژمێر١٠بەیانی.

٣٢- محمـــد قـــادر حـــاجی رەشـــید: چـــاو پێکـــەوتن لەبـــەرواری ٢٠١٤/٢/٢١، تەق تەق ،کات ژمێر ٨ی شەو.

٣٣- پرۆفیسۆر عززدین مستفا ڕەسوڵ: چاو پێکەوتن لەبەرواری ٢٠١٤/٢/٢١، سلێمانی، کات ژمێر ١١ی پێش نیوەڕۆ.

٣٤- عبدالکریم محمد أومر: چاو پێکەوتن لەبەرواری ٢٠١٤/٢/٢٥، تەق تەق ،کات ژمێر ٤ی ئێوارە.

٣٥- جومعە کانی لەلەیی : چاو پێکەوتن لەبەرواری ٢٠١٤/٢/٢٦، تەق تەق، کات ژمێر٨ی شەو.

٣٦- عبید عسمان حەمەدەمین: چاو پێکەوتن لەبەرواری ٢٠١٤/٣/٢٥، کۆیە، کات ژمێر ٤ی ئێوارە.

٣٧- سرهد حەمەعلی: چاو پێکەوتن لەبەرواری ٢٠١٤/٣/٢٥، کۆیە، کات ژمێر٤ی ی ئێوارە.

------ ------------- ------- -------



لەسەرگۆڕی (جمعە دەربەندی) باپیری دەربەندیەکان کەگۆڕەکەی لەکانی قەبرۆکی مەرزانە



پرۆفیسۆر دکتۆر عزەدین مستفا ڕەسوڵ



شارەزای مێژووی تیرەی دەربەندیەکان ڕەشید حمە علی حاجی وسمان



شارەزای مێژووی تیرەی دەربەندیەکان حەمەدەمین

حەمستفاقادر( لالە حمەدەمین شیرن)



عبدالکریم حاجی سۆفی حاجی ئومەر لەدایک بووی ۱۹۳۸ی ئومەرگومەت ۱



فتحیە عبدالقادرمحمد لەدایک بووی ۱۹٤٤ی ئومەرگومەت



شارەزای مێژووی تیرەی دەربەندیەکان عمر عزیز لەسەرگۆڕی جومعەدەربەندی لە کانی قەبرۆکی مەرزان



شەفیق عبدلقادرحمدامین لەدایك بوی ١٩٤٩ی سێگردکان



برایم عبدالرحمن برایم لەدایك بوی ١٩٤٠ی ئومەرگومەت



هەمینە محمد مەولود لەدایك بووی ١٩٢٧ی ئومەرگومەت



عبدالرحمن حمە حمەسور لەدایك بوی ۱۹۳۸ی نومەرگومەت



شیروەزەن ئوومەرگومەت (وێنەی بەرگ)

زانایك بایك لەت باشترە
لەوەی نەزانیك خزمەتت بكەیـــــك

Irdis A. Omergwmety

# Heta le wyrman neçywn

هەتا لە ویرمان نەچیون

دیزاین: بەشار پەیامی



گالەگێرەی گاوس خوەی سەری ژازکەیك